


# بەهێزکردنی باوەڕ

## بەکۆمەڵە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا

**نووسینی: محب بن مسکین**

**وەرگێڕانی: باوکی ڕەعد**

٢٠١٨ز

# بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی:

ان الحمد لله، نحمده، ونستعينه، ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهديه الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد ان لا إله إلا الله وحده لا شريك له، واشهد ان محمدا عبده ورسوله.

أما بعد:

خودای گەورە دەفەرمووێت{وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ الْمُبْطِلُونَ }[الجاثية ٢٧] واتە: لەم ڕۆژەدا کە قیامەت بەرپادەبێ، ناھەقکارو بێ بڕوایان ڕەنجەڕۆ دەبن.

نارەوایی و پوچی تا ڕۆژی دوایی کۆتایی نایەت، بەبەردەوامی خولی تازەی دەبێت، ھەڵدەستێتەوە و امۆش دەبێت، تاوەکو خودای گەورە زەوی دەگێڕێتەوە بۆلای خۆی لەگەڵ ئەوەی لەسەریشیدایە.

وە ھەموو لێکدانەوە کوفرییەکان بە کراوەیی دەمێننەوە تاوەکو کەسانی مایە پووچ بەردەوام بن لە مایە پووچیان، وە ئەوانەی کە لە دڵیان لادان و چەوتی ھەیە بەردەوام بن لەو لادانە، وە ئەوانەی کە شوێن ئایەتە لێکچوەکان دەکەون بەردەوام بن لەو شوێن کەوتنە کوێرانەیەیان {فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ }[ال عمران ٧] واتە: وە ئەو کەسانەی کە لە دڵیاندا لادان و چەوتییان ھەیە شوێن ئایەتە لێکچووەکان دەکەون- ئەو ئایەتانەی کە دوو مانا یان زیاتریان ھەیە و تەنھا خودا بە مانا ڕاستەکەی دەزانێت- بە ھیوای نانەوەی کێشەو لادان لە مانا ڕاستەکەی.

وە ڕاستگۆکان بەردەوام بن لەسەر ڕێگای ڕاست{قَالَ اللَّهُ هَٰذَا يَوْمُ يَنْفَعُ الصَّادِقِينَ صِدْقُهُمْ }[المائدة ١١٩] واتە: لەو ڕۆژەدا خودا دەفەرموێت ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە ڕاستگۆکان ڕاستگۆییەکەیان سوودیان پێ دەگەیەنێت و سەریان دەخات.

لە بەزەیی خودایە بەسەر بەندەکانییەوە کە کوفر تاوەکو هاتنی ڕۆژی دوایی بە بێهێزی و لاوازی دەمێنێتەوە، کە کەسانی مایە پووچ لێکدانەوە لە دوای لێکدانەوەی بۆ دەکەن، وە پێویستیان بە چەندان چارەسەرە بۆ چارەسەری کوفرەکەیان.

دوای ئەم هەموو ماندوو بوونە و لەگەڵ یەکەم نیشانەی ڕوون لە پێشینەکانی ئەقڵ و بەڵگەنەویستەکانی، پووچی دەتوێتەوە وەك چۆن بەفر دەتوێتەوە و دەکەوێت لەگەڵ ئەو هەموو دەنگەو هەوڵانەش کە بۆی دەدرێن هەروەك چۆن قسە پڕو پووچەکان دەکەون بەدرێژایی مێژوو{فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاءً}[الرعد ١٧] واتە: بەم شێوە خودا نموونەی ڕاستی و پووچی دەهێنێتەوە، جا کەف و کوڵەکە دەڕوات و ڕاستی دەمێنێتەوە.

هەرگیز لە گفتوگۆیەکی دادوەرانە پووچی بەسەر هەق و ڕاستی سەرناکەوێت تا ڕۆژی دوایی{وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا}[الإسراء ٨١] بێگومان پووچی بەردەوام دۆڕاو و تیاچووە.

{وَلَنْ يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا}[النساء ١٤١] واتە: وە هەرگیز خودای گەورە ڕێنادا بێباوەڕان بەسەر مسوڵمانان سەرکەون.

ویستم لەم نوسراوە بچووکە کۆمەڵێك بەڵگەی دڵنیاکەرەوە کۆبکەمەوە بۆ ڕاستی پەیام و جێگیربوونی-هەبوونی- پەیامبەرایەتی، وە نوسراوەکەم پێشکەش کرد بە ناونیشانی (یاخود باوەڕهێنان یان ئاژاوەو فەوزا) تاوەکو مەبەستەکەی بەتەواوی بگەیەنێت.

**خودای گەورە ئێمەو ئێوەش ڕاسەترێ بکات بۆ چاکەو ڕاستی.**

# بەشی یەکەم

## [باوەڕهێنان یان ئاژاوە و فەوزا]

"بێباوەڕی بۆچوونێکی بوون نییە وەك بۆی دەچی، بەڵکو خەیاڵە، کە گومانێکی لە ناکاو دەیسەلمێنێت، وە ئارەزوویەکی هەڵچوو دەیهێڵێتەوە"

# باوەڕهێنان یان ئاژاوەو فەوزا

# Creed or Chaos

گەورە زانای جیهانی بێباوەڕان ڕیچارد دۆکینز دان دەنێت کە باوەڕهێنان بە پەیامبەران و پەیامەکان مەرجی بنچینەییە بۆ ناسینی چاکەو خراپە و ڕاست و هەڵە، دەڵێت (بەرگریکردن لە پێوەرە ڕەوشتییە ڕەهاکان زۆر گرانە، تەنها لەسەر زەوی ئایین نەبێ[١]).

تەنها لەنێو زەوی ئایندا دەتوانرێ لەمانای مرۆڤ بگەین و شیکردنەوە بۆ هۆکاری بوونی بکەین، وە بنچینە دانێین بۆ نرخ و ڕەوشت و بنچینەکانی.

لەدەرەوەی ئایین مرۆڤ دەگۆڕێت بۆ کۆمەڵێك گەردیلەی کۆبووەوە بەسەر یەکدا بێ هیچ واتایەك، کە دەجوڵێن بێ هیچ هۆکارێك و بەریەك دەکەون بێ بوونی ئامانجێك.

کوێری تەواو باری بێ بڕوایی کەڕ دەکات ناهێڵێت گوێی لە هیچ بێت، ئەوانەی کە خاوەنی ڕووناکی باوەڕ بە ئایین نین ناتوانن بیدۆزنەوە{وَمَنْ لَمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِنْ نُورٍ }[النور ٤٠] واتە: هەرکەسێك خودای گەورە ڕێنموونی نەکات و نووری هیدایەتی پێنەبەخشێت هەرگیز هیدایەت وەرناگرێت.

بەبێ بڕابوون بە پێغەمبەران هەموو شتێك ژەهراوی دەبێت.

(١) The god delusion p.232

وە هەموو بوون واتای خۆی لەدەست دەدات و زۆر گران دەبێت كە ڕەخنە لەكردارەكانی كەسێكی وەك هیتلر بگیرێت، لەم ڕوانگەشەوە ڕیچارد دۆكینز دان بەم ڕاستییە دەنێت و دەڵێت(چ شتێك ڕێگریمان لێ دەكات لەوەی كە بڵێین هیتلەر ڕاست نەبوو؟ مەبەستم ئەوەیە كە بەڕاستی ئەمە پرسیارێكی قورسە[1]).

مرۆڤ لە ڕوانگەی مادییەوە و لە ژێری- منطق-ی بێباوەڕی تەنها شێوەیەكی سێ دوورییە كە هیچ نرخێك بۆ بوونی نییە و هیچ مەبەستێكیش بۆ هەوڵەكانی نییە.

هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان كارە تاوانەكانی هیتلەر و كارەكانی چاكسازەكان، هەموویان بی مەبەستن- هیچ ئامانج و مەبەستێك لە ژیان نییە- لە ڕوانگەی بیرو بۆچوونی بێباوەڕی.

بۆیە دەتوانیت بڵێیت كە: بنچینەی ڕووناكی بەخششێكی خوداییە بە ئیمانەوە بەندە، هەموو فەلسەفەكانی جیهان ناتوانن یەك بریسكایی لە ڕووناكی دروستبكەن، هەموو بیرو بۆچونە مادديەكانی جیهان ناتوانن كەمێكیش لە نرخی مرۆڤ یان ئامانج لە بوونەكەی دابنێن.

هەموو دادگاكانی جیهان ناتوانن ڕێگری بكەن لە یەك تاوان لەسەر بنچینەیەكی ئەقڵی یان فیكری، مرۆڤ بەڕوانگەی بۆچونی ماددی لاشەیەكە پێكهاتووە لە كۆبوونەوەی گەردیلەكان كە جیا نابێتەوە لە ڕێكخراوەیەكی ماددی و وە هیچ جیاوازییەكی نییە لەگەڵ دارو بەردو ماددەكانی تر، وە هیچ ئامانجێك بە بوونی مرۆڤ نایەتەدی، تەنانەت وشەی "ئامانج" مانای خۆی لەدەست دەدات.

---

(١) http://byfaithonline.com/richard-dawkins-the-atheist-evangelist/

بێباوەڕی لا أدري[١] بەناوبانگ کارل ساگان دەڵێت (مرۆڤ... بەرهەمی هەمان یاساو جێگیرانەن کە پێویستە بۆ دروستبوونی بەردێك[٢]).

مامۆستای زانکۆی هارفارد جۆرج سیمیۆن وەسفی ئەوپەڕی بۆچونی بێباوەڕی دەکات بەرامبەر بە مرۆڤ و دەڵێت (مرۆڤ هیچ شتێك نییە تەنها کارلێکێکی سروشتی بێ ئەنجام نەبێت، کەلە ژماردن نایەن[٣]

جۆرج سیمسبۆن کە زانایەکە لە بواری گەڕان بەدوای بەبەردبووەکان و یەکێکە لە بەناوبانگترین ئەو کەسانەی کە بانگەشەی بیردۆزی پەرەسەندن دەکەن دەڵێ (مادده هیچ حسابێکی بۆ درووست بوونی ئێمە نەکردووە، چونکە ئێمە بەگوێرەی ڕوانگەی بێباوەڕێ هاتوینەتە بوون بەهۆی هێزی سروشتی توندوتیژ، وە ئێمە نەخشەکێشیمان بۆ نەکراوە تاوەکو لەسەرووی دروستکراوەکان بین).

لەڕاستیدا بێباوەڕی وەڵامێکی لەمە باشتری لانییە.

کەسی بێباوەڕیش ناتوانێت نرخێك بۆ ژیانی دانێت لە چوارچێوەی ئەم بینینە ماددیەی کە هەیەتی بۆ دروستبوون.

ستیفن گای گۆڵدی لا أدري کە باوەڕی بە پەرەسەندن هەیە دەڵێت (ئێمە لێرەین چونکە کۆمەڵێکی سەیر لە ماسییەکان پەڕەکانیان خاوەن پێکهاتەی تایبەت بوون کە توانیان بگۆڕێن بۆ قاچەکان، وەڵامێکی لەمە باشتر بوونی نییە[٤])

---

(١) لا أدري: کەسێکە کە بڕوای بە خودا نییە و نازانێت ئایا خودا بوونی هەیە یان نا، تەنانەت بیریشی لێ ناکاتەوە و ناشزانێت بۆچی هاتۆتە دنیاوە و فەلسەفەی بوون چییە. (وەرگێڕ).

(2) Carl Sagan, Pale Blue Dot: A Vision of Human future in Space.

(3) Simpon, George Gaylord. 1970. The Morning of evaluation. New Haven, CT: Yale University Press, P.345

(٤) (1) The meaning of life: reflection in words and picture on why we are here, 1991, p.30

بەتەواوی لە ڕوانگەی بێباوەڕی وەڵامێکی لەمە باشتر بوونی نییە.

هەرکەسێك خودای لەبیر چوو، خۆی لەبیر دەچێت و نرخ و مانای ژیانیشی لەبیر دەچێت{وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنْسَاهُمْ أَنْفُسَهُمْ}[الحشر ١٩] واتە: ئەی باوەڕداران وەك کافرەکان مەبن کە خودایان لەبیر کرد وە خوداش سەرگەردانی کردن و خۆیان لەبیر کرد.

پاکی وبێگەردی بۆ خودا، ئەمە ڕێبازێکە لە هەموو گەردوون جیاوازی نییە، ڕێبازێکی گەردوونیە کە شوێن هەموو کافرێك دەکەوێت کە بیەوێ خودا لەبیر بکات، کە لەئەنجامدا خۆی لەبیر دەکات.

بەم شێوەیە مرۆڤ لەناو ڕێبازی بێباوەڕی ناتوانێت واتایەك بۆ نرخی خۆی و ڕەوشت و مەبەستی بوونی دەست کەوێت.

تۆ ئەگەر دەتەوێت مانای بوونی مرۆڤ لەناو بەریت لەم جیهانەدا وە بنچینەکانی ژیان و پێوەرە ڕەهاکانی ژیانی لەناو بەریت شتێکی زیاتر مەکە لە لابردنی مەبەستی بوونی وە هەوڵبدەی وای تێبگەیەنیت بەوەی کە بوونی ئەم کەسە بونێکی بێسوودیە.

ڕێبازی بێباوەڕی لەمە زیاتر هیچی نەکردووە!

ڕیچارد دۆکینزی بێباوەڕ بەشانازییەوە باسی کەسێك دەکات کە پێی وتووە سێ ڕۆژی لەسەر یەك نەنوستووە، دوای ئەوەی کە گەڕاوە بۆ بۆچوونی بێباوەڕی بۆ بوون کە دۆکینز لە کتێبەکانی باسی دەکات، ئەم کەسە ئەمەی بینیەوە- وتەکە لەسەر زمانی دۆکینز دەگێڕدرێتەوە- کە ژیان بریتییە لە بۆشایەتییەکی بێ مانا[1]!

ئەمە ئەم شتەیە کە ڕێبازی بێباوەڕێ هەوڵێ بۆ دەدات.

---

(1) Reinventing the future, p.112

لەم چوارچێوەیەدا کە بوون مانای خۆی لەدەستداوە، گەورەترین تاوانەکان بێ مانایە، خراپەکاری لەسەر زەوی دەگۆڕێت بۆ جووڵەی گەردەکان بەبێ ئامانج، آرثر ألین لیف مامۆستای یاسا لە کۆلێژی یال لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەڵێت (ڕێگایەك نییە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە سوتاندنی منداڵان بە بۆمبی ناپالم کارێکی خراپە[١] )

ئەگەر خودا نەبوو سووتاندنی منداڵان بە بۆمبی ناپالم بابەتێکی ڕێژەییە لە شارستانییەتەکان.

ئەگەر پێشەکییەکەت لۆژیکی بوو ئەوا ئەنجامیشت لۆژیکی دەبێت.

ناتوانیت لەناو ڕێبازی بێباوەڕێ پێشەکی یان ئەنجام بە خراپەکاری دابڕێژی.

بۆ دڵنیابوونەوە لەوەی کە باسکرا شیزیلاو میلۆچ کە خاوەنی خەڵاتی نۆبڵە لە بواری ئەدەب لە وتارێکیدا بەناوی (مفاتن العدمیه الحذرة) دەڵێت (بێباوەڕی ئەفیۆنی گەلانە، باوەڕت بەوەی کە ژیان لە دوای مردن بوونی نییە گەورەترین بێهۆشکەرییە بۆ بەها بەرزەکان).

بێباوەڕی هۆکارێکی مەزن دەبەخشێت بە ستەمکاران و بکوژان و داوێن پیسان بەوەی کە نە زیندووبونەوە هەیە نە لێپرسینەوە.

لەناو ئەم بێهۆشکردنە بەئەنقەستە بۆ بەها بەرزەکان دەست درێژیکردن بۆسەر ئافرەتان دەبێتە کارێکی ئاسایی، ئەمەش تێڕوانینی ڕێچارد دۆکینزە بۆ تاوانی دەست درێژیکردن کە دەڵێت( باوەڕبوونت بەوەی کە دەست درێژیکردن هەڵەیە ئەوە بەتەواوی هەڕەمەکییە[٢]).

---

(1) there is today no way of “proving” that napalming babies is bad, Economic Analysis of Law: some Realism about Nominalism(1974).

(2) Your belief that rape is wrong is an arbitrary conclusion From an interview with Justin Brierley of unbelievable.

ڕیچارد دۆکینز پێکاویەتی کە دەڵێت (تۆ چوزانی کە دەست درێژیکردن هەڵەیە و خۆپارێزی باشترە؟).

پشت بەچ پێوەرێك دەبەستیت بۆ بڕیاردان لە کارێکی هەڵە و کارێکی ڕاست؟

ئەگەر ئەمە ئاژاوە و فەوزا نەبێت ئەی چ شتێك فەوزایە؟

**دەڵێین:** بۆچوونی بونی خودا و باوەڕهێنان بە ئایین تەنها پێویستیەك نییە، بەڵکو پێویستییەکی زۆر گرنگە، لێرەدا ئەقڵ بیردۆزە دانانێ، بەڵکو دەربڕینی پێویستییەکی گرنگە وەك گرنگی ئاو و هەوا بەڵکو لەوانیش لەپێشترە.

ناسینی خودا پێویستییەکی ئەقڵییە لەخودی ڕێبازی ماددیەتدا، وە لەسروشتی خۆمان وەك مرۆڤ.

ئێمە داوای شتێك دەکەین کە هیچ شتێك ناتوانێت جێگای بگرێتەوە لە جیهاندا، ئەمە ئەو بانگەوازە ئاسمانییەیە کە لەپێشدا لەڕۆژێك لەڕۆژان لێیەوە هاتوینە.

ئەمە بانگەوازی بەها ڕەوشتییەکانە کە هەمووومان باوەڕمان پێی هەیە.

ئەمە بانگەوازی فیترەیە.

ئەم فیترەتەی کە لەڕێیەوە بوونی چاکە و خراپە و ڕاست و هەڵە و پیرۆزی و پیسی پێ دەناسینەوە و لەڕێیەوە لێیان دڵنیا دەبینەوە.

ئەمە بانگەوازی مرۆڤەکانە کە ڕێبازی بێباوەڕی ناتوانێت لێی تێبگات.

ئەو مرۆڤەی کە بۆ شیکردنەوەی بوونی هەموو شیکارییەکان شکستیان هێناوە و شکستیش دەهێنن جگە لە باوەڕبوون نەبێت.

## باوەڕهێنان یان ئاژاوەو فەوزا

## Creed or Chaos

جیهان هەڵبژاردنی سێیەمی نییە.

بیر لە جیهانێك بکەوە بێ ئایین و بێ باوەڕبوون بە درووستکەر، بیر لە جیهانێك بکەوە بێ زیندوو کردنەوە و بێ لێپرسینەوە.

ئەگەر ژیان لە دوای مردن بوونی نەبێت هەموو ئەو جوانییەی کە هەیە لە باخچە و شەپۆڵ و گوڵەکان دەگۆڕێن بۆ ترس[١].

بێگومان بینین لەڕوانگەی بێباوەڕی بۆ جیهان، جیهان مانای خۆی لەدەست دەدات وە جوانی لەناو دەبات و نرخی شتەکان دەکوژێت و جوانترین شتەکان دەگۆڕێن بۆ ترس.

تێڕوانینی بێباوەڕی بوونی هەموو شتەکان دەکاتە بوونێکی ناپێویست، وە هەموو ئامانجە جوانەکان دەکاتە قسەی پووچ و بێ قیمەت، وە جوانترین خەونەکانی بەهەشتی دەگۆڕێت بۆ کابوسێکی ترسناك، وە بوون هەرهەمووی دەبێتە شتێکی بێ مانا.

جان پاوڵ سارتر باسی ئەم ڕاستییە بێزارکەرە دەکات لە چیرۆکەکەی بەناوی غثیان ( هەرگیز پێویست بەبوونی شتەکان ناکات وە ژیان هیچ مانایەکی نییە، منیش بە دیارکەوتوم- هاتوومەتە بوون- لەڕێگای ڕێکەوت وەك میکرۆبێك، هەرگیز نەدەبوو من هەبم[٢]).

Mayflies ئێمە شتێکی پیشاندراوی بێ قیمەتین لەم گەردونەدا وەك مێشی مایۆ

(١) لە چیرۆکی ریش الحمام

(2) Jean Paul Sarter, Nausea (novel).

کە دەردەکەوێت و ون دەبێت، هەروەك بانگخواز و نوسەری ڕێبازی ماددی چیت ڕایمۆ باسمان دەکات[1].

هەموو ئامانجانەی کە وای دەبینین ئامانجی بەرزن، تەنها خەیاڵێکن، هەروەك بێباوەڕی بەناوبانگ ڕیچارد دۆکینز دەیڵێت[2].

بەڵام لەڕوانگەی سەیرکردنی باوەڕدارانەوە بەتەواوی پێچەوانەی ئەمانەیە، کە جیهان دەکاتە شتێك کەلێی تێبگەین و حیکمەتێکی هەستپێکراو و تاقیکردنەوەیەکی وەرگیراو و هەوڵدانێکی پاداشت دراوە، هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت{يَا أَيُّهَا الْإِنْسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَاقِيهِ}[الإنشقاق ٦]

واتە: ئەی مرۆڤ تۆ لەهەوڵدانێکی جدیدایت کەبەرەو لای پەروەردگارت دەگەڕێیەوە و سەرئەنجامی هەوڵەکانت دەبینیتەوە.

گواستنەوە لە بێباوەڕی بۆ باوەڕبوون مەرجێکی ژیری و ئەقڵییە بۆ تێگەیشتن لە ماناو ئامانجی مرۆڤ.

ئەو دروستکراوەی کە ناتوانرێ لێی تێ بگەین لە چوارچێوەی مادده و ئەو یاسایانەی کە مادده پێوەی بەندە.

ئەو دروستکراوەی پێیەکانی لەناو قوڕ چەقییوە لە کاتێکدا بەرەو ئاسمان هەوڵدەدات.

لە پێناو ئەمەش گواستنەوە لە جیهانی هەستپێکراو- ماددی- بۆ جیهانی نموونەیی- جیهانی باوەڕهێنان و پەنهان- دەبێتە ویستی مرۆڤی وشیار لەبارێکدا کە بیەوێت لە خۆی بگات، بۆیە کەسانی بیرمەند لەهەموو شارستانییەتەکان وێناکراون بەوەی کە کەسانی دابڕاون لە جیهانی ماددی، چونکە ئەوان سەرقاڵن بەو ڕاستیانەی کە ناتوانیین بە هەستەکانمان پەییان پێ ببەین، بەڵکو بە ئەقڵ و لۆژیك پێی دەگەن.

---

(1) Ramyo, Chet, 1998. Skeptics and True Believers. New York, NY: Walker, p.222.

(2) A Scientists Case Against God.

لە ڕابردوو ولە ئێستاشدا زانینی میتافیزیك- پشت سروشت- لەلای بیرمەندان بەرزترین ڕۆشنبیری و ڕێزدارترینییانە، چونکە تاکە زانستە پەیوەستە بەلێکدانەوەی ڕاستییەکان و بوون و پرسیارە گرنگەکانی ژیان، دەبینین دیکارت دەڵێت (بیری مرۆڤ دارێکە ڕەگەکەی میتافیزیکە وقەدەکەی فیزیایە ولق وپۆپەکەی زانستەکانی ترە[١])

بنچینەی گواستنەوە بۆ باوەڕداری بنچینەیەکی ئەقڵییە، کە ئامانجە بەرزەکانی گەڕانە بەدوای بوونە ڕاستەقینەکان- پەنهان-.

ئەو ڕاستییەی کە مرۆڤەکان ئێستا خۆیان داوەتە دەستی بریتییە لە: هیچ ڕاستییەك نییە لە دەرەوەی ماددەی سەربەخۆ، وە ناتوانرێ ڕاستییەکان ڕێك بخرێن بەبێ ئایین و پەنا بردن بۆ میتافیزیك، وە ناتوانرێ بنچینە بۆ ڕاستی دابنرێ یان زانیارییەکان ڕێك بخرێن یان نرخ بۆ واتای ژیان دابنرێ بەبێ ئایین.

تۆ بەبێ ئایین دەگۆڕێیت بۆ بارستاییەك لە خانە کە لەسەر دیوارەکانی ئایۆنەکانی سۆدیۆم و پۆتاسیۆم بەریەك دەکەون، وە دەبیتە شێوەیەکی ماددی لە شۆربای سایتۆپلازمی پرۆتینی بەبێ سنوور و چوارچێوە.

مرۆڤ هیچ شتێك نییە جگە لە کۆمپیوتەرێکی گۆشتی هەروەك شیت ڕایمۆ دەیڵێت[٢].

بەڵکو ڕایمۆ ئەم بابەتە وادادەنێ- بوونی مرۆڤ تەنها وەك کۆمپیوتەرێکی گۆشتی- ئەمە نزیکە لە شتێکی بەڵگە نەویست لای کەسانی بێباوەڕ[٣].

---

(1) Descartes, principes de la philosophie, p.26.

(2) (2) Ramyo, Chet. 1998. Skeptic and True Believers. New York, NY: Walker, p.187-188

(٣) هەمان سەرچاوە ل. ١٩٢

لەم چوارچێوەیە بەرگری کردن لە تۆ زۆر گران دەبێت.

هەموو هەڵەیەك دەبێتە ڕاست و هەموو ڕاستێك دەبێتە هەڵە، مانایەك نییە بۆ ڕاست و هەڵە.

ڕیچارد دۆکینزی بێباوەڕ بابەتەکە کورت دەکاتەوە و دەڵێت( گەردوون لە ڕاستیدا بەبێ نەخشە داڕێژەرێکە، بەبێ ویست و مەبەستێکە، بەبێ خراپە و چاکەیە، هیچ شتێك نییە جگە لە کوێرییەکی دڵڕەق کە گوێ بەهیچ نادات[1]).

لە نێو ئەم وێنە لێك هەڵوەشاوە مەترسیدارەدا کوشتنی مرۆڤ دەبێتە شتێکی ئاسایی، وە ئەنجامدانی هەموو تاوانەکان دەبێتە کارێکی بێ لایەن.

وە ڕاگەیاندنی دۆکینز دەڵێت ( کوشتنی کۆرپەلە کارێکی ئاسایيە) دەبێتە کارێکی چاوەڕوانکراو[2].

کۆرپەلە بەلای دۆکینز بارستاییەك لە خانەی بێ نرخە.

تێڕوانینی دۆکینز زیاتر پەرەدەسەنێت بۆ تێگەیشتن لە ڕێبازی بێباوەڕی و بڕیار دەدات کە (خواردنی گۆشتی مرۆڤ هیچ ڕێگرییەك لێی نییە بەمەرجێك کە مرۆڤەکان دوژمن بن نەك هاوڕێ[3]).

هاوپیشە و هاوڕێی دۆکینزی کاهینی بێباوەڕان سام هاریس دەردەکەوێت کە زیاتر و زیاتر ڕێبازی بێباوەڕی قوتدەدات و بڕیار دەدات کە (ڕێگری نییە لە کوشتنی هاوڕێیان و دوژمنان مادام هەڵگری بیری جیاوازبن لەتۆ[4]).

---

(1) River out of Eden, P. 131-132.

(2) The god delusion, p. 297, 29.

(3) Selfish Gene, p. 8

(4) The End of Faith, p. 52

هەروەها ئەو ستەمکارە دەڵێت ( وە ڕێگری نییە لە لەناوبردنی مسوڵمانان بە بۆمبێکی ئەتۆمی کە لە ڕەگەو ڕیشەوە نەیان هێڵین تاهەتا[1]).

ئەمە دەرهاویشتەی چاوەڕوانکراوی بێباوەڕییە، ئەمانە کۆڵەکەی بێباوەڕین لە جیهان.

سوپاس بۆ خودا لەسەر بەخششی ئیسلام، خودای گەورە لە خراپەی ئەمانە بمان پارێزێت.

بەم شێوەیە مرۆڤ لەناو بێباوەڕێدا پارچە پارچە دەبێت لە جیهانێکدا کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ناگات بەڕاستی، وە مرۆڤ پەی بەڕاستی بونی خۆی نابات تەنها لەناو پانتایی باوەڕدا نەبێت.

لە ناو باوەڕدا مرۆڤ دەتوانێت تێبگات لە هەستی ڕەوشت، هەستی جوانی، هەستی فیتری، هەستی ویژدانی، هەستی بەهاکان و هەستی دینی، وە ڕازی دەبێت بە خۆبەدەستەوە دان بۆ شتە مانابەخشەکان، وە بەم شێوە مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ بە مرۆڤ بوونی خۆی جارێکی ترلە کاتی دەستپێکردنی گەشتی ململانێی یەکەمی لەگەڵ ویستە پرۆمیسیۆسەکانی- هەڵگەڕانەوە لە دروستکەرەکەی- وە هەوڵدانی بۆ دیاریکردنی قەدەری خۆی بەدەستی خۆی نەك بەدەستی پەروەردگاری.

بێگومان ئەم داستانە گەورەیە- داستانی گەڕانی کەسی بێباوەڕ بەدوای مەبەستی بوون لە چوارچێوەی ماددە- ئەم چیرۆکە کۆنەی گەشتیارەکەمان بەبیر دەهێنێتەوە کە خەونی بینی لە خەونەکەیدا وایان پیشاندا کە ڕۆژێك لە ڕۆژان گەنجینەیەکی مەزن دەدۆزێتەوە لە ژێر زەوی، وە پیاوەکە بەردەوام بوو لە گەشتکردنی بە وڵاتان و بڕینی دۆڵەکان و ڕێگا فراوانەکان لە گەڕان بەدوای دۆزینەوەی گەنجینەکەی، دوای ڕۆیشتنی چەندساڵێك لە هەوڵدانی و دوای ئەوەی کە ڕۆژگار ماندووی کرد گەڕایەوە ماڵەوە بە شکاویی و خەم و دڵتەنگی و ململانێی دەکرد لەگەڵ بەختی خراپ و داخ و پەژارە و بێ سوودی و ون بوون و بێ مانایی و بێ ئامانجی!

---

(1) Harris, S. (2006) the End of Faith, the free press, p. 129

لە کاتێکدا ئەو بەم شێوەیە بوو دەفرێکی لە دەستی بەربوەوە سەر زەوی و بوە هۆی دروستکردنی لەرینەوەیەکی گەورە!

بەدەست شوێنەکەی هەڵکۆڵی تا گەنجینەیەکی دۆزییەوە لە ناو ماڵەکەی خۆیدا کە سەرەتای نەبوو، ئەمە ئەو گەنجینەیە بوو کە لە دوای دەگەڕا[1]!

بێگومان ئەم گەنجینەیەی کە مرۆڤ لەدوای دەگەڕێت لە جیهانیی مادە بونی نییە، لە جیهانی ماددەدا هیچ شتێك نادۆزیتەوە جگە لە شتی ماددی نەبێت، هیچ شتێك نادۆزیتەوە تەنها خۆراکی لاشە نەبێت، بەڵام خۆراکی ڕۆحی لەم جیهانەدا- جیهانی ماددە-دا بوونی نییە.

مرۆڤ نابێتە مرۆڤ وە ناتوانێت بنچینەیەك دابنێت بۆ نرخی خۆی و مەبدەئی و ڕەوشتەکانی جگە لەژێر سێبەری بەها بەرزەکان ڕەوشتەوە نەبێت کە هیچ پەیوەندییەکیان بە جیهانی ماددەوە نییە.

بێگومان مانای ژیان لەناو خۆت هەیە، لە فیترەتت، لەو نەخشە و بەرنامەیەی کە خودای گەورە تۆی لەسەر نەخشاندوە و بەرنامەی بۆ داناوی{صِبْغَةَ اللَّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ صِبْغَةً}[البقرة ١٣٨] واتە: ئەمە ئایین و بەرنامەی خودایە کە تۆ ئێستا لەسەری، دەبێ کێ لەخودای گەورە بەرنامەی جوانتر بێت.

ئەگەر ئێمە ڕۆڵەی ئەم جیهانە بوایەین، هەستمان نەدەکرد بە ئازار و غەریبی و گەڕانمان لەدوای نرخی شتەکان وە ئەم وتانە مانایەکیان نەدەبوو.

لە چیرۆکی (البؤساء)ی ڤیکتور هۆگۆ کات ڕادەوەستێت لەو کاتەی کە جافیری ئەفسەر خۆی هەڵدەداتە ناو ڕوباری سین دوای ئەوەی کە تاوانبار جان فالجان ئازادی دەکات لە دوای گرتنی.

---

(١) ڕۆمانی کیمیاگەر، نوسینی: پاولۆ کۆیلۆ... (وەرگێڕ).

ئەم بڕیارەی ئەفسەرەکە ئەنجامی ململانێیەکی دەروونیە کە ناتوانرێ بەرگەی بگرێ، ئەو نەی دەزانی کە ئەم تاوانبارە- جان فالجان- لەو بەسۆزترو نەرم و نیانترە، وە ئەو دەتوانێت لەخەڵك خۆشبێت و لێخۆشبوونی خۆش دەوێت و لەخەڵك دەبورێت.

ئەم ململانێ دەروونیەی کە لەدەروونی ئەفسەرەکە ڕوویدا هیچ مانایەکی نییە ئەگەر ئێمە ڕوحمان نەبێت!

ئەگەر ئێمە ڕۆڵەی ئەم جیهانە بوایەین شتی پیس و پاك نە دەبوو، مانای بونی ئێمە لە جیهانێکی ترەوە سەرچاوە دەگرێت.

ئێمە دڵنیایین و پەیدەبەین بەوەی کە ئێمە هاتوینەتە ئەم جیهانە بە سەرمایەیەکی بەرزی زانیاری و ڕەوشتی و بنچینەییەکی زۆر.

ئێمە ڕۆڵەی جیهانێکی ترین کە مانای ژیان و نرخی و ئامانج و مەبستی لێ وەردەگرین، وە ئەو بابەتانەی کە بڕوامان پێی هەیە بۆ ئەم جیهانەی دەگێڕینەوە وە ئاوازەکەی لە جیهانی دەرەوە نادۆزینەوە.

بێگومان ئەم ململانێ ناکۆتاییەی لە نێوان ویژدان و بەرژەوەندی، ململانێیەکە لەم جیهانە ماددییە شتێك نییە کە بوونی بسەلمێنێت، جیهانی ماددی دەرەوە جگە لە بەرژەوەندی هیچ شتێکی تر نازانێت، بەڵام ویژدان تایبەتمەندییەکی بەستراوە بە مرۆڤەوە، هەروەها نرخی شتەکان تایبەتمەندییەکە تەنها لە ڕۆحدا هەیە، بێگومان مانای مرۆڤی ڕاستەقینە هیچ مانایەکی نییە بێجگە لەو پێشەکییە ئاسمانییەی کە هەیەتی ئەمە کۆتا بیرۆکەیە بۆ دیاردەی بوونمان، بێگومان گواستنەوەمان لە بێباوەڕی بۆ باوەڕداری سەرچاوەی وەرگرتن و شیکردنەوە و ناسین و لێکدانەوەی بوونی هەموو مرۆڤایەتییە.

**بۆیە یاخود باوەڕهێنان یان ئاژاوە و فەوزا... وە هەڵبژاردنی سێیەم نییە.**




" ئەگەر پێغەمبەرایەتی نەبوایە هەموو خەونەکان و بەها بەرزەکان و ڕەوشتە بەرزەکان دەگۆڕان بۆ کابوسێکی مەترسیدار"

## دیاردەی پێغەمبەرایەتی

## پێغەمبەرایەتی و ئەقڵ!

پێغەمبەرایەتی هۆکاری ناسینی ڕاست و دروستە بۆ ناسینی خودا- الله- وە زانینی ویستەکانی لە دروستکراوەکانی، ئەگەر پێغەمبەرایەتی نەبوایە ڕێنموونی ڕووی نەدەدا و زانینی مەبەستی بوون و سەرەنجامەکان لە دوای مردن و واتای دونیا بەگشتی نەدەزانرا.

بەڵام هەندێك بێباوەڕ وای دادەنێن کە ئەقڵ شوێنی پێغەمبەرایەتی دەگرێتەوە لەگەیشتن بە هەندێك مانای ئەو ڕاستییانەی کە بە هەستەکان نایان گەینێ لە بووندا.

ئەمەش کەم وکوڕییەکی دیارە، ئەقڵ ناتوانێت بە تەنها بگات بە ڕێنموونی و هیدایەت، ئەگەر وانەبا ئەو کەسانەی تەنها پشت بە ژیری- عەقڵ- دەبەستن هیچ کاتێك جیاوازییان لە نێوان درووست نەدەبوو، لەکاتێکدا جیاوازییەکی زۆر لە نێوانیاندا هەیە.

کاتێك خەڵکی تەنها کاریان بە ئەقڵ کرد بڕوایان بە خودا هێنا وە بڕوایان بە بتەکان کرد و پادشاکانیان پەرست و بێباوەڕ بوون و بوون بە لا أدري لە یەك کاتدا.

پێدراوەکانی ئەقڵ زۆر جیاوازن وە دەرەنجامەکانی بێزارکەرە و ئاڵۆزترە لەوەی پێشبینی بۆ دەکەین.

ئەقڵی مرۆڤ هیچ کەرەستەیەکی ڕاستەقینەی نییە ڕێگری لێ بکات لە توشبوون بۆ دروستکردنی خورافات و ئەفسانە و خەیاڵ و وڕێنە وە قەبوڵکردنی هەموو ئەمانە و بە ڕاست دانانییان.

د. ثامر غشیان دەڵێت " بەبێ گەڕاندنەوەی ئەقڵ بۆ کاری سەرەکی خۆی لەناو چوارچێوە و بەڵگە نەویستەکان کە وەحی دەیبەخشێت و کیتاب دورییەکانی دیاری دەکات، بەبێ ئەم گەڕانەوەیە ئێمە ستەم لە ئەقڵ دەکەین و دەیخەینە ناو گۆڕەپانێك کە گۆڕەپانی ئەم نییە.

دەیخەینە ناو کۆمەڵە جەنگێ کە جەنگی ئەو نییە، دواى ئەوە ئێمە سەرکۆنەی دەکەین ولێی تووڕە دەبین ئەگەر گەڕایەوە بەنائومێدی وشکان ودڵتەنگی[1]"

پاشان سەیری مێژووی گەلان و فەلسەفەکانیان و ڕۆشنبیرییە کۆن و نوێیەکان بکە، وە سەیر بکە ئایا تەنها بە ئەقڵ گەیشتوون بە ئەنجامی ڕازیکەر لە یەك بابەت لە بابەتی پرسیارە گرنگەکانی ژیان وەك: ئێمە بۆچی دەژین، لە دوای مردن دەچین بۆ کوێ، وە لەدوای مردن چی هەیە؟ یاخود هەموو گەلان گەڕانەوە بە سەر لێشێواوی و ون بوون کە هانا بۆ دەرگای تر ببەن بۆ گەڕان بەدوای وەڵامەکان؟

ئایا ستیڤن هۆکینزی فیزیا زانی شارەزا لەیەکەم لاپەڕە لە کۆتا کیتابی( التصميم العظيم) دانی نەنا بەوەی کە **فەلسەفە مرد؟**

بەڵام بە ڕاشکاوی ئەوەی کە مرد فەلسەفە نەبوو، بەڵکو پشت بەستن بوو بە ئەقڵ بە تەنها لە بابەتی پرسیارە گرنگەکانی ژیان!

ئەقڵ بەبێ پێغەمبەرایەتی وەك چاو وایە بەبێ میکانیزمی بینین، وە وەك گوێ وایە بەبێ میکانیزمی بیستن، {وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَا يَسْمَعُونَ بِهَا ۚ أُولَٰئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ}[الأعراف ١٧٩] واتە: ئەمانە- ئەم بێباوەڕانە- چاویان هەیە بەڵام پێی نابینن، وە گوێیان هەیە بەڵام پێی نابیستن، ئەمانە وەك ئاژەڵ وان بەڵکو گومڕاتریش، ئەمانە کەسانی بێ ئاگا و بێ هەستن.

دیکارت(١٦٣٧) هەوڵی دا تەنها بە ئەقڵ بگات بە مانای بوون بۆ ئەمەش ڕێگای گومانی بەرنامەیی بەکارهێنا، بەم ڕێگایە توانی بیروباوەڕەکانی لە هەموو بابەتەکان cogito بڕوخێنێت تەنانەت لە بیرکردنەوەکانیشی، پاشان دوای فەلسەفەی کۆجیتۆ کەوت.

- من بیر دەکەمەوە کەواتە من هەم- کە ئەمەشی هەر بەبەکارهێنانی ئەقڵ کرد.

---

(١) الرسالة خاتم النبيين محمد صلى الله عليه وسلم، د.ثامر بن ناصر، مكتبة الراشد.

پاشان ئەم كۆجیتۆیە ڕووخا لەسەر دەستی دیفید هیوم ئەمیش بە بەكارهینانی ئەقڵ.

پاشان فەلسەفەی نوێگەرێتی دەركەوت لەسەردەستی كانت بە بەكارهێنانی ئەقڵ، كە ئەمیش توایەوە بە هۆی ڕێبازی (دوای نوێگەرێتی) كە فەلسەفەیەكی نوێ بوو.

كەواتە ئەقڵ بونیاد دەنێت و دەڕوخێنێت...بەرز دەكاتەوە و نزم دەكاتەوە... دەپەرستێ و بت درووست دەكات.

هیچ توانایەك نەماوە بۆ دامەزراندنی هەست و نرخ و مانایەك بۆ بوون بە بەكارهێنانی ئەقڵ بە تەنها.

بۆیە د. عبدالحلیم محمود- خودا ڕەحمی پێ بكات- شەیخی ئەزهەر دەڵێت( ئایین كەشتییە و ئەقڵ پارچە دارێكە، ژمارەیەكی كەم هەن كە بە بەكارهێنانی پارچە دار ڕزگاریان بوبێت[1]).

ئەندریە جید بیرمەندی بەناوبانگی فەڕەنسی كەسێكی زیرەك بوو، كاتێك طە حسێن داوای لێ دەكات كە كارەكانی وەرگێڕێتە سەر زمانی عەرەبی، ئەندریە جید وەڵامی دەداتەوە بەسەرسامیەوە و دەڵێت (پێشنیارەكەت تووشی سەرسامی كردم... كەسی مسوڵمان وەڵامی زیاتری پێیە لەو پرسیارانەی كە لێی دەكرێت[2]).

ئەو ئەقڵەی كە سیفەتەكانی خودا دەناسێت و پەیامی خودایی دەناسێت وەڵامی پرسیارە گرنگەكانی ژیان دەزانێت، لە كاتێكدا ئەو كەسەی پێغەمبەرایەتی ڕەد دەكاتەوە كۆمەڵە كۆپیەكی بێ كۆتای بیرو بۆچوونی هەیە سەبارەت بە بوون- كە ئەستەمە ڕزگاری بێت لەناویان-.

---

(١) سەیری (یوسف كرم: تاریخ الفلسفة الیونانیة) بكە.

(٢) المراسلات مع أندرية جيد. رسالة من أندرية جيد إلى مترجم كتابه (الباب الضيق)، باريس فی ٥ يوليو ١٩٤٥.

ڕازی لە کۆتا بەرهەمەکانی خۆی دوای ئەوەی کە ڕۆچوو لە زانستە پێشینەکان- ئەو زانستانەی کە لەسەرەتای دەست کرد بە خوێندن دەیخوێنیت- تاوەکو گەرووی هات، وە لە ئاوی فەلسەفەی خواردەوە تاوەکو پڕ بوو، لە کۆتاییدا دەڵێت (سەیری ڕیگاکانی کەلامی[1] و بەرنامەی فەلسەفەم کرد، نەم بینی کە چارەسەری نەخۆش بکات یان تینویەتی کەسی تینوو بشکێنێت، وە بینیم کورترین ڕێگا ڕێگای قورئانە، هەر کەسێك هەمان تاقیکردنەوەی من بکات و هەمان زانینی منی دەست دەکەوێت، وە کۆتایی بەپێش خستنی ئەقڵ- پێشخستنی ئەقڵ بەسەر قورئان و فەرموودە- خۆ بەستنەوەیە[2]).

**بەڵێ، کۆتایی پێشخستنی ئەقڵ بێ بەرچاوڕوونی وەحی خۆبەستنەوەیە.**

ئەقڵ کۆمەڵە پێوانەیەکی بێ کۆتای هەیە بۆ لێکدانەوەی بابەتەکان، وە شێوازی جیاوازی هەیە، کەواتە چۆن کەسێك بە ئەقڵی ڕزگاری دەبێت کە بزانێت پێشنیارەکانی ڕێژەییە و لێی دڵنیانییە؟

ئیبن قوتەیبە دەفەرمویت (پێویست بوو لەگەڵ ئەو شتەی کە بانگەشەی بۆ دەکەن- بە پیرۆز ڕاگرتنی ئەقڵ- لە زانیاری پێوانەکردن و ئامادەکردنی نموونەی بەرچاو کە جیاوازییان لە نێوان نەبوایە هەروەك چۆن ژمێریار و ئەندازیاری ڕێگاوبان و ئەندازیارەکانی تر جیاوازیان لە نێوان خۆیان نییە، چونکە ئامێرەکانیان دەبێتە بەڵگە تەنها بۆ یەك ژمارە، یان لەسەر یەك شێوە، کەواتە ئەمانە چیانە کە لەهەموو خەڵك جیاوازییان زۆرترە؟ دووان لە سەرۆکەکانیان لەسەر یەك بابەت کۆك نیین[3] ).

ئەم کۆمەڵانەی کە پشتیان تەنها بە ئەقڵ  بە ستووە لە بیرکردنەوەدا چەند لێك جیاوازن!

---

(١) المراسلات مع أندرية جيد. رسالة من أندرية جيد إلى مترجم كتابه (الباب الضيق)، باريس ٥ يوليو ١٩٤٥.

(٢) ثبوت النبوات ص ٣١٨

(٣) تأويل المختلف الحديث ص١٤.

ئیمامی غەزالی- بەر ڕەحمەتی خودا بكەوێت- لە بارەیانەوە دەڵێ (بەڕاستی تێكەڵكردنەكانیان دور و درێژە، و ململانێیان زۆرە، وە بیروبۆچوونەكانیان پەرت و بڵاوە، وە ڕێگاكانیان لە یەكتر دوورو پێچەوانەیە[1]).

هەروەها دەڵێت (بەرپەرچ دانەوەكانی ئەرستۆ بۆ ئەفلاتۆن بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئەوان بە گومان و بۆچوون بڕیاردەدەن، ئەگەر هاتبا و زانستە ئەقڵیەكانییان تەواو بایە لەڕووی بەڵگەوە وەك زانستە ژمێریارییەكانیان ئەوا جیاواز نەدەبوون، وەك چۆن لە زانستە ژمێریارییەكانیان جیاواز نەبوون[2]) .

كەواتە ئەقڵەكان جیاوازن، وە هیچ وەڵامێك بوونی نییە جگە بە ناردنی پێغەمبەران نەبێ، كە جیاوازییەكان كۆتایی پێدێنێت لە نێوان ئەقڵەكان.

ماوردی دەڵێت (بابەتە ئەقڵییەكان لەوانەیە جیاوازبن لەو بەڵگانەی كە دەی هێننەوە و بە ناردنی پەیام بەران جیاوازییەكانیان كۆتایی پێهات[3]).

وە جیاوازی ئەقڵەكان تەنها لە جیاوازی تێگەیشتنەكان نییە، وە تەنها لە جیاوازی توانا و بۆچوونەكان نییە، بەڵكو ئەقڵ خۆی هەموو ساتێك دەگۆڕێت، سەیری خۆت بكە لەم ڕۆدا و لە دوێنێ و لە سبەی، سەیربكە تۆ لەچی تێنەدەگەیشتی پاشان تێی گەیشتی، پاشان لەوانەیە سبەی وتبێتت بە وشە یاخود شتێكی تر تێگەیشتبێت، ئەمە حاڵی تۆیە، تۆش تەنها بە ئەقڵی خۆت نەك بە ئەقڵی كەسی تر ئەوەندە پێچەوانە دەبیتەوە و دەگۆڕێیت.

گەورەترین ڕەحمەتی خودایی ناردنی پەیامبەران و پەیامەكانە، هەموو ئەوەی كە تیایاندایە چاكترە لەوەی كە خەڵكی لەسەری كۆبوونەتەوە بە ئەقڵە فوتێكراوەكانیان[4]).

---

(١) تهافت الفلاسفة ص ٧٦.

(٢) تهافت الفلاسفة ص٧٦.

(٣) أعلام النبوة للماوردي ٢-٦٨

(٤) الملل والنحل ٢-٣٧١

زیادەڕۆیی لە نرخاندنی ئەقڵ درۆیە، وە ڕێگریکردنی ئەقڵ لە بیرکردنەوە و بینین لەوانەیە ببێتەهۆی کوفر کردن{وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ}[الملك ١٠] واتە: لەو ڕۆژەدا کافرەکان دەڵێن ئەڵێن ئەگەر ئێمە بمانبیستبا یان بیرمانبکردایەتەوە ئەوا ئێمە لە دۆزەخ نشینان نەدەبووین.

ئەقڵ گۆڕەپانی خۆی هەیە، وە پێدراوەکانی ئەقڵ ڕێگای خۆی هەیە کە تیایدا کارەکانی بەباشی بەڕێوە دەبات، بەڵام ئەم ڕێگایانە لە دەریای ئەقڵە نەك لە دەریایەکی تر، ئەگەر پێدراوەکانی ئەقڵ لە دەریای خۆی ببرێتە دەرەوە ئەوا نوقم دەبێت و خاوەنەکەیشی نوقم دەکات.

نموونە بۆ ئەوە: ئەقڵ لەوانەیە خۆی بە قەرزار بارو سوپاسگوزار دابنێت بۆ رۆزیدەری بەخشەر، ئەمە بەڵگەیەکی ئەقڵییە لە سەیرکردن بۆ بوونەکان وە بینینی نازو نیعمەتە نەژمێردراوەکان، بەڵام ئەقڵ تەنها خۆی چۆنیەتی سوپاسکردنی دروستکەری نازانێت، وە ڕێگایەکیش بۆ ئەمە نازانێت، وە مەرجەکان و کاتەکانی بەندایەتی ڕاستەقینە نازانێت.

تەنها بە نوسراوی شەرعی بەڵگە دەهێنرێتەوە و ڕێگای سوپاسگوزاری دەزانرێت و بەندەکان پێی بەرزدەبنەوە و کەسە خۆبەگەورەزانەکان نزم دەبنەوە.

شەهرستانی دەڵێت( لەوانەیە بەهۆی ئەقڵ چاکە بزانرێت، بەڵام واجب نابێت تەنها بە بیستن- بەڵگەی دینی- نەبێت[(١)]).

تۆ بەئەقڵت تێ ناگەیت کەچیت لەسەرە، بەڵام لەهەمان کاتدا هەست بە پێویستیت بە دروستکەرەکەت دەکەیت.

لێرەدا ئەقڵ پێشدەکەوێت و وەحی دەبێتە شۆفێر و ڕێنمونی ئەقڵ دەکات.

ئەمەش بۆ ئەوەی باسمانکرد زیادبکە: ئەقڵ ناتوانێت لە شتی پەنهان تێبگات، هەروەها درێژەی بابەتی ئەودیو سروشت و بەشەکانی نازانێت، چ جای دەربارەی هەموو ئەودیو سروشت چ جای دەربارەی داننان بە بوونی یان ڕەتکردنەوەی!

---

(١) نهاية الأقدام للشهرستاني ص ٣٧١.

ئیبن خەلدون لە پێشەكییەكەی دەڵێت (ئەقڵ... هیوای ئەوە مەخوازە كە بابەتەكانی یەكتاپەرستی و ڕۆژی دوایی و ڕاستی پەیامبەرێتی و ڕاستی سیفاتە خواییەكانی پێ بكێشیت، وە هەموو شتێك كە لەودیو سنووری بێت، ئەمە خواستێكی مەحاڵە، نموونەی ئەمە وەك پیاوێكە كە تەرازویەكی زێڕ كێشان دەبینێت، ئەخوازێت كە چیاكانی پێ كێش بكات، ئەمەش ناكرێت[١]).

ئەقڵ ناتوانێت شتێك دەرك پێبكات تەنها لە چوارچێوەی پێدراوەكانی نەبێت، وە شتێكی لەمە بەدەری لێ چاوەڕوان ناكرێت.

**بەڵام با بپرسین:** سودی زانینی بەشێكی دیاریكراو لە زانست چییە لە چوارچێوەی خۆت لە كاتێكدا تۆ نەزان بیت بە مەزنترین داواكراو لێت؟

سوودی هەست كردنت بە سوپاسگوزاری بۆ دروستكەرت چییە لە كاتێكدا تۆ بە ئەركی خۆت هەڵناسیت بەرامبەر دروستكەرەكەت؟

سوودی بینینی نیشانەكانی دروستكردن و شاهێدی ڕاستەقینە و حیكمەتی نیعمەتەكان بە ئەقڵت چییە، كە پاشان ڕاستترین كارت نازانیت بەرامبەر ئەمانە و مەبەستی بونت نازانیت؟

چ پاشكەوتوویی و لادانێكی زانیارییە كە ئەم بەرهەڵستی كاری پەیامەكان دەیانەوێت تیایدا بژین؟

---

(١) المقدمة ص ٤٥٩.

تێبینی: هەندێك نموونەكان وەرگیراون لەم وتارەدا وەرگیراوە لە كیتابی ( رسالة خاتم النبيين محمد صلى الله عليه وسلم د. ثامر بن ناصر، مكتبة الرشد).

# هەموو چاکەیەك لە بوون سەرچاوەکەی لە لایەنی پەیامبەرانەوەیە

بەبێ پەیامبەران و نامەکان و باوەڕبوون بە پەیامبەرانەوە، هەموو بەهاکان لەم جیهانەدا دەگۆڕێت بۆ کەفی سەر دەریا.

بەبێ باوەڕبوون بە پەیامبەران مرۆڤ دەگۆڕێت بۆ تەنها پاشماوەی ئەستێرەکان هەروەك اللاأدري کارل ساغان دەڵێت[1].

بێ ملکەچ بوون بۆ ڕاستی پەیام هەموو شتێکی جوان دەگۆڕێت بۆ ترس و گەردوون دەگۆڕێت بۆ شتێکی بێ ئامانج، وە هەموو ئامانجە بەرزەکان دەبن بە قسەی پووچی بەرگە نەگیراو[2].

ئەمانە کۆمەڵە بەڵگە نەویستێکن کە کەسی بێباوەڕ و باوەڕدار تیایدا هاوڕان، جیهان نرخی خۆی لە خۆیدا وەرناگرێت، بەڵکو نرخەکەی لە پەیامێکی دەرەوەی جیهانی ماددی وەردەگرێت.

بۆیە کەسێك خۆی لانادات لە باوەڕهێنان بە خوداو پەیامەکانی تەنها کەسێك نەبێت کە بیەوێت واتای بوونی خۆی لەناو ببات، و مەبەستی بوونی خۆی لە ژیاندا بێ نرخ بکات، {وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُ ۚ وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ}[البقرة: ١٣٠] واتە: کێ هەیە کە خۆی لە کۆمەڵەی ئیبراهیم پێغەمبەر لابدات تەنها کەسێك نەبێت کە کەم ئەقڵ بێت، وە ئێمە ئیبراهیم مان لە دونیا هەڵبژارد و بە پاکی ڕامانگرت، وە لە دواڕۆژیشدا لە پیاوچاکانە.

(1) Video sourse: The Shores of the Cosmic Ocean (episode 1) min6, sec4
(2) Cosmically inconsequential bundles of stardust, adrift in an infinity and purpesless universe.

زانای پایەبەرزی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەڵێت( هەموو چاکەیەك لە بووندا لای پێغەمبەران سەرچاوە دەگرێت، وە هەموو خراپەیەکیش لە جیهاندا تایبەتە بە بەندە بە هۆکاری سەرپێچیکردنی پێغەمبەران یان بە شارەزانەبوونە بەو پەیامەی کە بۆیان هاتووە، وە بەختەوەری بەندەکان لە ژیان و لێپرسینەوەیان بە شوێنکەوتنی پەیامە، وە پەیامیش پێویستە بۆ بەندەکان و دەبێت هەیان بێت،

وە پێویستی بەندەکان بۆ پەیام لە سەرووی هەموو پێویستییەکانە، وە پەیام ڕۆح و ڕووناکی و ژیانی جیهانە، چ چاکسازییەك بۆ جیهان دەبێت کە بێ ڕۆح و ژیان و ڕووناکی بێت،

وە جیهان تاریکی و نەفرەت لێکراوە تەنها ئەگەر خۆری پەیامی بەسەر هەڵهاتبێت،

بەم شێوەیەش ئەگەر بەندە خۆری پەیامی لە دڵدا هەڵنەهات و نەچووە ناو ژیان و ڕۆحی ئەم بەندەیەش لە تاریکیدایە و لە ڕیزی مردووانە، خودای گەورە دەفەرموێت {أَوَمَنْ كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَنْ مَثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِنْهَا ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ}[الأنعام: ١٢٢] واتە: ئایا ئەو کەسەی مردوو بوو و ژیاندمانەوە و ڕووناکییەکمان پێ بەخشی کە بەهۆیەوە لە نێو خەڵکی دەڕوات وەك ئەو کەسە وایە کە لە تاریکیەکدایە ناتوانێت لێی دەربچێت، بەم شێوەیە کافرەکان کردەوەکانیان لەبەر چاو جوانکراوە.

ئەمە وەسفی کەسێکی باوەڕدارە، کە کەسێکی مردوو بوو لە تاریکی نەزانیدا، خودا ژیاندییەوە بە ڕۆحی ژیان و نووری باوەڕ، وە نوورێکی پێ بەخشی کە بە هۆیەوە لە نێو خەڵکی دەڕوات.

وە کەسی کافر دڵی مردووە- لە تاریکیدایە-، وە خودای گەورە پەیامەکەی ناو ناوە ڕۆح، ئەگەر ڕۆح نەبێت ژیان لە دەست دەچێت، خودای گەورە دەڵێت{وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنْتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَٰكِنْ جَعَلْنَاهُ نُورًا نَهْدِي بِهِ مَنْ نَشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ}[الشورى:٥٢].

واتە: بەم شێوەیە ئەم قورئانەمان بۆتۆ بەوەحی نارد، کە ڕۆح و ئەقڵ دەژیەنێتەوە، تۆ پێش وەحی نەتدەزانی کیتاب و بڕوابوون چییە بەڵام ئێمە ئەم قورئانەمان کردە ڕووناکی بەهۆیەوە ڕێنوێنی هەر کەسێکی پێ دەکەین لە بەندەکانمان، وە بێگومان محمد(صل الله علیه وسلم) تۆش خەڵکی بۆ ڕێگەیەکی ڕاست ڕێنوێنی دەکەیت.

خودا لێرەدا باسی دوو بنچینە دەکات کە ئەمانیش (ڕۆح و ڕووناکی)ین[1].

ئایا مرۆڤەکان لە چ تاریکاییەك دەژین بە ئینکاریکردنی پێغەمبەران و پەیامەکانییان؟

هەموو مرۆڤەکان بەو فیترەت و نەخشەیەی کە خودا بۆیانی کێشاوە باوەڕیان بە ئەرکە ڕەوشتییەکان هەیە، تەنانەت لە نێو بێ باوەڕانیش ئەم باوەڕە هەیە، بەڵام هیچ شتێکی ماددی پاساو نادات بە دەست بۆ ئەرکە ڕەوشتییەکان، ئایا سەرچاوەی ئەرکە ڕەوشتییەکان چییە؟

**هەروەها:** هیچ شتێکی ماددی نییە کە پاساو بدات بۆ ئازاری ویژدان و هەستکرنمان بە شەرمەزاری لە کاتی ئەنجامدانی کاری هەڵە.

ئەگەر پەیامەکان بونیان نەبێت ناتوانین باسی هیچ کارێك بکەین بەوەی کە ئەم کارە (ڕەوشتییە) و کارێکی تر (نا ڕەوشتییە)، تەنها دەتوانیین بڵێین ئەم کارەم بە دڵە و ئەم کارەم بە دڵ نییە.

بەخۆ دابڕاندنمان لە خودا و پەیامەکان ناتوانین پۆزش بهێنینەوە بۆ ئەرك و ماف و دادپەروەری و بەهای شتەکان، ئێمە لە جیهانێکداین کە لە بنەڕەتدا گرنگی بە ڕەوشت نادات.

یاخود ئەم ڕەوشتانە شتێکی بێ نرخن لە جیهانی ماددی، یان ئەم ڕەوشتانە ماناکەیان لە جیهانێکی تر وەردەگرن.

بۆیە پەیام ڕۆحی ئەم جیهانەیە، تاکە هۆکاری ژیانەوەیەتی، بەبێ پەیامیش جیهان بەم هەموو قەرەباڵغییەی دەگۆڕێت بۆ جەستەیەکی خامۆش.

---

(١) مجموع الفتاوى ١٩- ٩٤، ٩٣

جیهان تاریكایی و نەفرەتییە ئەگەر خۆری پەیامی لێ هەڵنەهات هەروەك زانای پایە بەرز ئیبن تەیمیە وا دەڵێت، پەیام ڕۆح و ڕووناكی و ژیانە بۆ جیهان.

دیاردەی پەیام و پەیامبەران لەم دیاردانەن كە مێژوو لەسەری دەوەستێت بە سەرسامی و دڵنیایی، هاتنی پەیام تاكە ڕووداوێك نییە كە دووبارە نەبوبێتەوە، هەروەها بارێكی دەرونی نییە لای ئەم كەسانەی كە بانگەشەی پەیامبەرایەتی دەكەن، بەڵكو شتێكی تەواو پێچەوانەیە، زۆرێك لە پەیامبەرانی وەك " یونس، ئەرمیا، محمد" لەسەرەتادا ڕاوەساون و ترساون لە مەوقیفەكە و لێی ڕایان كرد، بەڵام دواتر بانگەوازەكەیان چەسپاند دوای ئەوەی كە بۆیان ڕوون بوەوە كە پەیامەكە لەدەرەوەی نەفسی خۆیانە.

بەرەنگارییان لە سەرەتادا بەڵگەیە بۆ بەرهەڵستی كردنییان لە نێوان هەڵبژاردنی خۆیان و ویستی بەرزی خودایی كە چواردەوری ویستی خۆیانی داوە، ئەمەش بەڵگەیەكی بەهێزە بۆ سەربەخۆبوونی پەیام لە ویستی كەسی و ململانێی دەروونی.

پەیام ڕووداوێكی تاك نییە، بەڵكو دووبارە دەبێتەوە لە چەندین شوێن و كاتی جیاواز، مالك كوڕی نەبی دەڵێت ( ناردنی هەر پەیامبەرێك ڕوداوێكی تاك نییە تاوەكو ببێتە ڕوداوێكی نامۆی دەگمەن، بەڵكو پێچەوانەی ئەمەیە، دیاردەیەكی بەردەوامە و دووبارە دەبێتەوە بە ڕێك و بەردەوامی، دیاردەیەكە دووبارە دەبێتەوە لە خۆیدا،ئەمەش بە گەواهیدەرێكی زانستی دادەنرێت كە دەتوانرێت بەكاربهێنرێت بۆ دانان بە بنچینەیی بوونی پەیامەكە بەمەرجی دڵنیابوون لە ڕاستگۆیی پەیامبەرەكە، بە ڕیككەوتنی ڕاستی پەیامەكە لەگەڵ ئەقڵ و سروشتی بنچینەكانی پەیامەكە[1]).

---

(١) مالك بن نبي، ظاهرة القرانية ص٨٧

دەربارەی دڵنیابوون لە ڕاستی و دیاریکردنی پەیام ئاسان و سانایە، وە نیشانەکانی زۆرە و ناوەستێت و چاودێریکەر ناتوانێت بیانژمێرێت.

ملکەچ بوون بۆ ڕاستی پەیام دەوەستێتە سەر ڕاستگۆ بوونی بانگەشەکەرەی و زیاتر نا.

زکی نجیب محمودی فەیلەسووف دەڵێت (ملکەچ بوون بۆ پەیامی پێغەمبەر ئەوەندە ناوەستێتە سەر بەڵگەی ئەقڵی کە پێشکەشی دەکات، بە قەدەر ئەوەندەی ملەچ بوون بەندە لەسەر ڕاستگۆ بوونی خاوەن پەیام و ئەمانەت پارێزییەکەی[1])

بانگەشەکاری پەیام یاخود باشترین دروستکراو و کاملترینە لە نێو دروستکراوەکان- چونکە لە لایەن خوداوە نێردراوە-، یاخود کەمترین و ڕیسواترینیانە- چونکە بە درۆ لافی پێغەمبەرایەتی لێ دەدات، جا چۆن باشترین دروستکراو و کاملترینیان دەچوێنرێت بە کەمترین دروستکراو و ڕێسواترینیان؟

زانای پایە بەرز ئیبن تەیمیە دەڵێت (هەر دوو کەسێك بانگەشەی شتێك بکەن، یەکێکیان ڕاستگۆیە لە بانگەشەکەی و ئەوی تر درۆزنە، بێگومان پێویستە کە ڕاستگۆیی ئەم و درۆی ئەویتر ڕوون بکرێتەوە لە زۆر ڕوەوە، ڕاستگۆیی پەیوەستە بە چاکە کاری و درۆ پەیوەستە بە تاوانباری[2]).

هەروەها لە شوێنێکی تر لە نوسراوەکەی دەڵێت ( موعجیزە تاکە مەرجی پەیامبەرێتی نییە، بانگەشەکاری پەیامبەرایەتی یاخود ڕاستگۆترینی ڕاستگۆیەکانە یاخود درۆزنترینی درۆزنەکانە، هیچ کەسێکیش ئەم دوو جۆرە کەسەی لێ تێکەڵ نابێت تەنها کەسێك نەبێت کە نەزانترینی نەزانەکانە).

---

(١) لە کیتابی: موقف من المیتافیزیقیا، زکي نجیب محمود

(٢) الأصفهانیة ص ٤٧٤.

مسوڵمانبووە یەکەمینەکانی وەك ئەبوبەکر و خەدیجە و وەرەقەی کوڕی نەوفەل مسوڵمان بوون پێش کەرتبوونی مانگ و هەواڵدانی پەنهان و تەحەدداکردنی بە قورئان... زۆر لە خەڵکی ڕاستی هەواڵدەرەکە دەزانن بێ هیچ نیشانەیەك، موسای کوڕی عیمڕان کە هاتەوە بۆ میسڕ و پێیانی وت کە خودا ئەوی ناردووە وەك پەیامبەر، ڕاستگۆیی ئەویان زانی بەر لە نیشاندانی بەڵگەکان بۆیان،هەروەها پێغەمبەر محمد(صل الله علیه وسلم) کاتێك کە باسی حاڵی خۆی کرد بۆ خەدیجە و چوون بۆلای وەرەقەی کوڕی نەفەل، وتی ئەو جوبریلەیە  کە هات بۆ موسا، هەروەها نەجاشی و ئەبوبەکر ڕاستۆیی ئەویان زانی بە زانستەوە کاتێك کە هەواڵێ ئەم پەیامەی پێدان کە پێی هاتووە و بەهۆی ئەو ڕاستگۆیی و ئەمانەت پارێزییەی کە لێیەوە دەیانزانی.

جگە لەم نیشانانە کە ڕاستگۆیی ئەم پەیامە بە ئەرك دادەنێت، هەواڵدانی تاکە کەسێکی نەناسراو لە تاکە تاکی خەڵك لەوانەیە ببێتە نیشانەیەك بۆ ڕاستی بابەتەکە، چ جای کەسێك کە ڕاستگۆیی و ئەمانەت پارێزییەکەی زانراوە کاتێك هەواڵێکی لەم شێوەیە دەدات کە هیچ کەسێك نایڵێت تەنها کەسێك نەبێت کە ڕاستگۆترینی خەڵکە یان درۆزنترین، وە ئەمانیش دەزانن ئەم کەسە لە کۆمەڵەی یەکەمە نەك کۆمەڵەی دووەم[1].

بەڵگە هێنانەوە بۆ ڕاستی بانگەوازی پەیام کارێکی ئاسانە.

وە پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) هیچ کەسێك نەی وتوە کە درۆی کردووە تەنانەت بۆ یەك جاریش.

هەموو خەڵکی دەستە وەستان بوون لە نیشاندانی یەك درۆ لە هەموو تەمەنی بەم هەموو هەڵوێست و هەواڵانەی کە دابووی.

---

(١) ثبوت النبوات عقلاً و نقلاً، شيخ الإسلام إبن تيمية، دار إبن الجوزي، ص ٥٧٣، بەهەمان واتاش نوسینێکی تر هەیە لە هەمان سەرچاوە ل ٣١٨.

"هەرگیز درۆمان لە تۆ نەبینیوە" "هەرگیز درۆمان لە تۆ تاقی نەکردوەتەوە" ئایا ئەم ڕستەیە یەکەم وەڵامی هاوبەش پەیداکەران نەبوو لە یەکەم گفتوگۆ لە نێوان پێغەمبەر و هاوبەش پەیداکەران دەربارەی پەیامەکەی[1]؟

بەڵکو پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) بەناوبانگ نەبووتەنها بە ڕاستگۆی دەست پاك نەبێت، بۆیە قورئان هەواڵی عەرەبی دا بەوەی کە فێڵبازن کاتێك کە پەیامەکەی پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) ڕەد دەکەنەوە، وە ئەوانیش حاڵی ئەو دەزانن بەر لە ڕەوانەکردنی و ئەو ڕاستگۆی دەستپاکە{أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُ مُنْكِرُونَ} [المؤمنون: ٦٩] واتە: ئایە قوڕەیش پێغەمبەرەکەی خۆیان نەناسی کە ئەوان باوەڕی پێ ناهێنن و دژی دەوەستن؟

ئەگەر سەیری کیتابەکانی پێشتر بکەیت ئەوا زیاتر دڵنیا دەبیتەوە!

پقیغەمبەر(صل الله علیه وسلم) لە کیتابە پێشینەکانیشدا بە ڕاستگۆی دەست پاك ناسراوە

سفری رؤیا- کۆتا بەشی کیتابی پیرۆز- کە بەشێکی تایبەتە بە پێشبینییەکانی ڕۆژی دوایی، وێنە و سیفەتی پێغەمبەر محمد(صل الله علیه وسلم) بۆمان نەقڵ دەکات و دەڵێت (پاشان بینیم ئاسمان کراوەیە و سوارچاکێك لەسەر ئەسپێکی سپی دانیشتووە  و پێی دەوترێت ڕاستگۆی دەستپاك، وە بە دادپەروەری بڕیار دەدات و دەجەنگێت[2]).

ئەو کەسە کێیە کە سواری ئەسپێك بووە و بە دادپەروەری بڕیار دەدات و دەجەنگێت، وە نازناویشی ڕاستگۆی دەستپاکە، وە نێردراوە لە ئاسمانەوە جگە لە محمد(صل الله علیه وسلم)، بێگومان بەڵگەی پەیام و ڕاستگۆیی پەیامبەر لەو بەڵگە ئەقڵیانەیە کە داوای زیاتر لە مرۆڤ ناکات جگە لە ملکەچ بوون و مسوڵمان بوون!

---

(١) سەیری تەفسیری الطبري بکە لە تەفسیری ئایەتی{ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ} الشعراء ٢١٤

(١) سفر الرؤيا إصحاح ١٩ عدد١١.

## باوەڕی بەندەیەك ڕاست نابێت کە باوەڕی بە پێغەمبەرێك هەبێت و کافربێت بە محمد(صل الله علیه وسلم)

پێغەمبەران بە دەورێکی سەرەکی هەستاون لە مێژووی مرۆڤایەتی، تەنها بەهۆی پێغەمبەرانەوە مرۆڤ بووە بە تەوەری مێژوو، وە مانای بوون و ئامانجی گەورەی بوونی لەم گەردوونەدا.

وە لە ڕێگای باوەڕبوون بە پێغەمبەران دڵنیا دەبینەوە لە بەرزی مرۆڤ و مانای نرخی مرۆڤ و ناوەندبوونی مرۆڤ لەم گەردوونە.

**هەروەك پێشتر بڕیارمان دا:** جیهان بێ پەیامەکان تاریکاییەکی ونە و زەویەکی بێ فەڕ و بیابانێکی وشکە.

ئەگەر پەیامەکان نەبوان نەفسەکان ئارام نەدەبونەوە و ڕێنمونییان وەرنەدەگرت و دڵەکان ژیانییان وەرنەدەگرت.

کەواتە پەیامەکان دڵەکان دەژیەنن و نەفسەکان ئارام دەکەنەوە و ڕینمونییان دەکەن.

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانییان.

هەموو کەسێکی نەزان بە زانستی خودایی، کە پێغەمبەران پەخشییان کردووە نەزانن بە مەزنترین داواکراو لە بووندا.

پێویستی بەندە بۆ پەیام گەورەترە لە هەموو پێویستییەکانی، پەیام پێویستە بۆ بەندەکان و پێویستە پەیامیان هەبێت.

پەیامی پێغەمبەر محمد(صل الله علیه وسلم) یەکەم پەیام نەبووە لە نێو پەیامەکاندا ە {قُلْ مَا كُنْتُ بِدْعًا مِنَ الرُّسُلِ}[الأحقاف:٩] واتە: ئەی محمد(صل الله علیه وسلم) پێیان بڵێ من یەکەم پەیامبەر نیم لە نێو پەیامبەران تا بەرهەڵستی پەیامەکەم بکرێ.

پەیامی محمد(صل الله علیه وسلم) هات بۆ چەسپاندنی یەکتاپەرستی و بەردەوامی شەریعەت و پاراستنی سەرچاوەکان- سەرچاوەکانی ئاین کە تەنها لای خوداوەیە-، وە چەسپاندنی تەرازووی چاکە کاری و سەرخستنی ئایین.

بەڵكو پێغەمبەر محمد(صل الله عليه وسلم) لە هەموو ئەمانەدا زۆرترین پشك و باشترین شوێن و بەرزترین پایەی هەبوو.

بێباوەڕان هیچ كەسێك نابیننەوە وەك محمد(صل الله عليه وسلم) خاوەن پلەی بەرز و جێگای سەرسامی خەڵكی بێت.

شەریعەتەكەشی تووشی گۆڕانكاری نەهات وەك چۆن بەسەر شەریعەتەكانی تر هات، بەڵكو ئەم شەریعەتە لەهەموو سەردەمێكدا نوێ و پاكە، وە لەكاتی مردنییەوە تاوەكو ئێستا پێویستی نەبووە بۆ ناردنی پەیامبەرێكی تر، یاساكان شەو و ڕۆژ دەخوێنرێنەوە وەك ئەوە وایە كە تازە لە زاری پێغەمبەر(صل الله عليه وسلم) دەرچووە.

هەركەسێك دانبنێت بە كۆمەڵی پەیامبەران كەمترین گۆمانی نامێنێت لە پەیامی محمد(صل الله عليه وسلم).

هەركەسێك درۆ بە پەیامی محمدبكات، ئەو كەسە درۆ دەكات بە پەیامی سەرجەم پێغەمبەرانی تر.

زانای پایەبەرزی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەڵێت (ئەو كەسەی درۆ بە پەیامی محمد(صل الله عليه وسلم) دەكات، درۆ بەم ڕێگایە دەكات كەلە ڕێیەوە ڕاستگۆیی پێغەمبەران و ڕاستی پەیامەكانیمان زانیوە.

ئەم ڕێگایەی كە ڕاستگۆیی پەیامی موسا و عیسای پێزانراوە، پەیامی محمدیشی(صل الله عليه وسلم) پێ دەزانرێت، ئەگەر وتیان پەیامی موسا و مەسیح زانراوە بەهۆی موعجیزەوە، وە موعجیزەكانیش بە نەقڵی گواستنەوەی موتەواتر[1] بۆ ئێمە زانراون، پێیان دەوترێت كە موعجیزەكانی محمد(صل الله عليه وسلم) مەزنترە و تەواتورەكەی زیاترە وە ئەو كیتابەی كە محمد هێناویەتی كامڵترە، وە گەلەكەی باشترە و شەریعەتی ئاینەكەی باشترە، موسا بە دادپەروەری هات و عیسا هات بۆ تەواوكردنی بە كرداری چاك و محمد(صل الله عليه وسلم) دادپەروەری و كرداری چاكەی بەیەكەوە كۆ كردەوە.

---

(١) موتەواتر ئەو فەرموودانەن كە ژمارەیەكی زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەر بۆ ژمارەیەكی زۆری تابیعینیان گێراوەتەوە (وەرگێر).

ئەگەر ئاسایی بێت بۆ كەسێك كە بڵێت محمد لەگەڵ ئەوەی كە هێناویەتی درۆیە، ئەو كەسە لەسەر ئەم هەڵسەنگاندنە پوچە لە پێشترە كە هەموو پەیامەكانی تریش بە درۆ دابنێت، چونكە حوكمدان لەسەر یەكێك لە دووشت، حوكمدانە لەسەر هاوشێوەكەیشی، ئەی چی ئەگەر ئەو شتە لەپێشتریش بێت؟

ئەگەر كەسێك بڵێت كە هارون و یوشەع و داود وسولەیمان پێغەمبەر بوون و موسا پێغەمبەر نەبوو، یان بڵێت داود و سولەیمان و یوشەع پێغەمبەر بوون و مەسیح پێغەمبەر نەبوو، یان ئەو كەسە وەك سامرییەكان بڵێت یوشەع پێغەمبەر بووە و ئەوانی تری وەك داود و سولەیمان و مەسیح پێغەمبەر نەبوون، یان وەك جولەكە بڵێت داود و سولەیمان و یوشەع و حەبقوق و میخا و عاموص و دانیال پێغەمبەر بوون و مەسیحی كوڕی مەریەم پێغەمبەر نەبوو، ئەمە وتەیەكی دژیەكە و بەتاڵە، ئەو كەسانەی كە ڕەدی پێغەمبەرایەتی ئەم پێغەمبەرانەیان دا پێغەمبەرایەتییەكەیان ڕاستر و كاملتر بوو لەو پێغەمبەرانەی كە پێغەمبەراەیەتییەكەیان بۆیان چەسپاند، وە بەڵگەكانی پەیامبەرێتی تەواوتر و باشترە، چۆن ڕێگادراوە بە پشتڕاستكردنەوەی پەیامی پەیامبەرێك كە ئەم پەیامبەرە موژدەی داوە بە پەیامبەرێك كە لەو پایەی بەرزترە، بەڵام پەیامی پەیامبەرە پایەبەرزەكە پشتڕاست نەكرێتەوە، ئەمەش وەك ئەوەی لێدێت كە كەسێك بڵێت زوفەر و ئیبن قاسم و موزنی و ئەثرەم شەرعزان بوون و ئەبو حەنیفە و مالیك و شافیعی و ئەحمەد شەرعزان نەبوون، یان بڵێت ئەخفەش و ئیبن ئەنباری و موبەڕڕەد نەحو زان بوون و خەلیل و سیبەوەی و فەڕاء نەحو زان نەبوون، یان بڵێت صاحب الملكی و مەسیحی و نموونەكانی وەك ئەمانە نوسەری پزیشكی بوون و پزیشكیش بوون وە بوقڕاط و كالینۆس و ئەوانیتر پزیشك نەبوون، یان بڵێت كوشیار و خەرقی و ئەوانیتر زانستی شێوەزانییان دەزانی و بەتلیمۆس و ئەوانیتر زانستی شێوەزانییان نەدەزانی.

وە كەسێك بڵێت داود و سولەیمان و میخا و عاموص و دانیال پێغەمبەر بوون، وە محمد(صل الله علیه وسلم) كوڕی عبدالله پێغەمبەر نەبووە، دژیەكییەكەی دیارتر و گەندەڵی وتەكانی دیارترە لەهەموو ئەمانەی كە لەسەرەوە باسمان كرد، هەروەها ئەو كەسەی كە بڵێت موسا و عیسا پەیامبەرن وە تەوڕات و ئینجیل كیتابی خودان و لای خودا دابەزێنراون وە

محمد پەیامبەر نییە و قورئان لە لایەن خوداوە دانەبەزێنراوە، پوچی قسەكانی زۆر ئاشكرایە وە بەڵگەیە بۆ كەسێك كە بكۆڵێتەوە لەوەی كە محمد(صل الله علیه وسلم) پێی هاتووە و پێغەمبەرانی پێش ئەمیش پێی هاتوون.

ئەم ڕێگایەی كە پێغەمبەرێتی پێغەمبەرانی پێ دەسەلمێنرێت بەهەمان شێوە و مەزنتریش پێغەمبەرێتی محمدیشی(صل الله علیه وسلم) پێ دەسەلمێنرێت بەهەمان شێوەو زۆر زیاتریش، بەڵكو بەڕاستدانانی پێغەمبەرێتی ئەو لە پێشترە لە بەڕاستدانانی پێغەمبەرێكی تر، محمد(صل الله علیه وسلم) هەموو ڕەگەزەكانی پێغەمبەرێتی بەدەست خست بۆ سەلماندنی پێغەمبەرێتی.

ئەوە جێگیر بوو لە ناردنی بۆ بەجێهێنانی یەكتاپەرستی و دانانی شەریعەتێكی دادپەروەر و جگە لە مانەش لە مەبەستەكانی ناردنی پەیامبەران مەزنترە لە پەیامبەرانی تر و زیاتریشە.

بەمەش دڵنیا دەبین كە پەیامەكەی تەواوتر و مەزنترە لەهەر پەیامێكی تر.

محمد(صل الله علیه وسلم) بەنەخشە و پەیامێك نەهاتووە لە دەرەوەی نەخشە و پەیامی پێغەمبەرانی پێش خۆی {بَلْ جَاءَ بِالْحَقِّ وَصَدَّقَ الْمُرْسَلِينَ}[الصافات ٣٧] واتە: بەڵكو محمد بە پەیامێكی ڕاست و بە پەیامی بەڕاستدانانی پەیامبەرانی پێش خۆی هات.

ئەگەر بەهۆی ئەم پەیامە نەبا كە بۆی هاتووە كێ فێری دەكرد كە پەرستنی بتەكان كارێكی پوچ و بەتاڵە؟

كێ فێری دەكرد كە پەرستنی خودایە مرۆییەكان پوچ و بەتاڵە؟

لەگەڵ ئەوەی كە عەرەب نەیان دەزانی لە حودا نزیك بنەوە تەنها بەهۆی بت و مرۆڤەكان نەبێت!

كێ فێری پارێزراوی پەیامبەرانی كرد تا پایەیان پاك بكاتەوە لەوەی كە شوێن كەوتوانی بۆیان هەڵبەست؟

کێ فێری سەرکردایەتی کردنی وازهێنان لەداوێن پیسی وئارەق وڕیبا و خراپەکاری کرد لەگەڵ ئەوەی شیعری عەرەبی و موعەلەقاتەکانیان[1] کە شانازییان پێ دەکرد لەسەر ئارەق و ئافرەت و غەزەل بوو؟

کێ فێری نزیك بونەوەی لە خودای کرد بە بەندایەتی کردن؟ ئایا هەموو ئەمانە ڕێگای پێغەمبەرانی پێش خۆی نەبوون؟

{مَا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِنْ قَبْلِكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ}[فصلت: ٤٣] واتە: بێگومان محمد(صل الله علیه وسلم) هەر ئەو قسانەت پێ دەگوترێت کە بە پەیامبەرانی پێش تۆ وتراوە، بێگومان خودای تۆ خاوەن لێبووردەیە و خاوەن سزایەکی بە ئێشە.

محمد(صل الله علیه وسلم) یەکەم پەیامبەر نەبووە کە بۆ جیهان نێردراوە، بۆیە هەرکەسێك باوەڕی بەیەکێك لە پەیامبەران هێنا، لەهەمان کاتدا بڕیاریدا کافر بێت بە محمد(صل الله علیه وسلم) ئەوە کەسێکی گومڕای قسە هەڵبەستە {إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ ثُمَّ ازْدَادُوا كُفْرًا لَنْ تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الضَّالُّونَ}[آل عمران: ٩٠] واتە: ئەو کەسانەی کە کافر بوون بە محمد(صل الله علیه وسلم) دوای باوەڕهێنانیان بە موسا و لەسەر کوفر بەردەوام بوون تا مردن- جوولەکەکان- کە پشتیان لە عیسا کرد، کاتێ محمدیش هات کوفرەکەیان زیاتر بوو و ڕویان لەویش وەرگێڕا، ئەو کەسانە هەرگیز تەوبەیان لێ وەرناگیرێت تا لەسەر ئەم هەڵوێستەیان بن و ئەوانە سەر لێشێواون.

ئیمام جەلالەدین سیوطی-ڕەحمەتی خودای لێبێت- لە تەفسیری هەمان ئایەت دەڵێت ( ئەو کەسانەی کە کافر بوون بە عیسا دوای باوەڕهێنانیان بە موسا، پاشان کوفرەکەیان زیاتر کرد بە محمد، ئەوانە تەوبەکانییان لێ وەرناگیرێت و خودا لێیان خۆشنابێت کە لەسەری بمرن یان بە کافری بمرن، ئا ئەمانە بەڕاستی کەسانی گومڕا و سەرلێشێواون).

---

(١) موعەلەقات: ئەو شیعرانەبوون کە لەکاتی حەجکردندا هەڵدەواسران لە کەعبەدا، ئەوانەش دەگەڕێنەوە بۆ چەند شاعیرێك کە لە هەرە شاعیرە گەورەکانی عەرەب بوون.

ئەو کەسانەی کە بەڵگە ڕوون و ئاشکراکانییان پێ گەیشت دەربارەی ڕاستی پێغەمبەرایەتی محمد(صل الله علیه وسلم) وە ئەوان حاڵی پێغەمبەرانی پێش ئەویان دەزانی وە ئەوان شاهیدی حاڵی محمدیش بوون، دوای ئەمەش پەیامەکەیان ڕەدکردەوە، ئەو کەسانە کەسانی گومڕا و سەرلێشێواون{كَيْفَ يَهْدِي اللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ وَشَهِدُوا أَنَّ الرَّسُولَ حَقٌّ وَجَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ ۚ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ}[آل عمران:٨٦] واتە: چۆن خودای گەورە ڕێنمایی گەلێك دەكات كە كافربوون دوای باوەڕهێنانیان، وە شاهید بوون کە پەیامبەرەکەیان ڕاست و حەقە و بە بەڵگە و نیشانەی ڕوون بۆیان هات، خوداش ڕێنایی گەلی ستەمکار ناکات.

وەفدێکی مەسیحییەکان هاتن بۆلای پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) کە خەڵکی نەجران بوون، ویستیان موباهەلەی پێغەمبەر بکەن، بەڵام کاتێك کە حاڵی پێغەمبەریان بینی و حاڵی پەیمەکەیان زانی و لێکچوەکانیانیان لەگەڵ پەیامی پێغەمبەرانیان بینی کە لەپێش ئەو هاتبوون پەشیمان بوونەوە لە موباهەلە و ترسان.

لەسەر ئەمانەی خودای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە{فَمَنْ حَاجَّكَ فِيهِ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا نَدْعُ أَبْنَاءَنَا وَأَبْنَاءَكُمْ وَنِسَاءَنَا وَنِسَاءَكُمْ وَأَنْفُسَنَا وَأَنْفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَلْ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ}[آل عمران: ٦١] واتە: هەرکەسێك ڕووبەڕوو بونەوەی لەگەڵ کردیت دەربارەی عیسا دوای ئەوەی ئەو زانیارییانەت بۆ هات دەربارەی عیسا لەلایەن خوداوە، ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن، وەرن بەیەکەوە بانگی کوڕانمان و خێزانەکانمان بکەین و لە جێگایەك کۆ ببینەوە، پاشان موباهەلە بکەین و نەفرینی خودا بکەین لە کەسانی درۆزن.

موباهەلەکەش بریتیبوو لەوەی کە بڵێن خودایە نەفرەت بکە لە کەسی درۆزن دەربارەی عیسا، پێغەمبەریش ڕازی بوو.

وە خۆی و حەسەن و حوسەین و عەلی و فاطمە هاتنە دەرەوە، وە پێیانی وت ئەگەر دوعام کرد ئێوەش ئامین بکەن، مەسیحییەکانیش وتیان: ڕاوێژێك لە نێوان خۆمان دەکەین و پاشان دێین بۆ لات، خاوەن بڕیارەکەیان وتی: سوێند بە خودا ئەی کۆمەڵی مەسیحییەکان ئێوە زانیتان کە محمد پێغەمبەرێکی نێردراوە، وە هیچ گەلێك موباهەلەی پێغەمبەرێکیان نەکردووە

ئیلا لە ناو چوون، بۆیە پەشیمان بونەوە لە موباهەلە كردن و ڕێكەوتن لەسەر جزیە دان[1].

بیربكەرەوە!

بیربكەورەوە ڕێكەوتن لەسەر جزیە دان، لە بەرامبەر ئەوەی كە دوعایان لێ نەكات؟

ئەمانە گەیشتنە چ ئاستێكی خۆ بەگەورە زانین و سەركەشی؟

لە عبدالله ی كوڕی عەباس دەگێڕنەوە دەڵێت: ئەگەر ئەو كەسانەی داوای موباهەلە كردنیان كرد چوبان بۆ موباهەلە كردن، دەگەڕانەوە نە ماڵ و سامانیان دەما و نە خاو و خێزانیان نەدەبینییەوە.

ئەمانەی كە شاهێدی ڕاستگۆیی پەیامەكە بوون، هیچ بەهانەیەكیان نییە بۆ كوفر كردنیان خودای گەورە دەفەرمویێت{يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَأَنْتُمْ تَشْهَدُونَ}[آل عمران: ٧٠] واتە: ئەی ئەو كەسانەی كە كیتابی خوداتان بۆ دابەزیوە، بۆچی كوفر دەكەن بە ئایەت و بەڵگە و نیشانەكانی خودا لە كاتێكدا ئێوە دەزانن ئەمە حەق و ڕاستییە؟

باوەڕی بەندیەك ڕاست نابێت كە پەیامی پەروەردگاری بۆ هاتبێت و هەندێك لە پەیامەكان وەربگرێت لە كاتێكدا پەیامەكانی تر ڕەد بكاتەوە، خودای گەورە دەفەرمویێت{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَآمِنُوا بِرَسُولِهِ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِنْ رَحْمَتِهِ وَيَجْعَلْ لَكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۚ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ}[الحديد: ٢٨] واتە: ئەی ئەو كەسانەی كە باوەڕتان هێناوە بە موسا و عیسا تەقوای خودا بكەن و باوەڕ بە پەیامبەرەكەی — محمد- بهێنن، خوداش دوو پاداشتتان ئەداتەوە لە بەزەیی خۆی، وە ڕووناكیەكتان پێ دەبخشێت كە بەهۆیەوە ڕێی پێ بكەن، وە لە تاوانەكانیشتان خۆش دەبێت، وە هەر خوداش لێبووردەی بە بەزەییە.

(١) وەرگیراوە لە تەفسیری البغوي.

ئەی ئەو كەسانەی كە باوەڕتان هێناوە بە عیسا، لە خودا بترسن و بڕوا بهێنن بە پەیامبەرەكەی كە محمد(صل الله علیه وسلم) و عیسایە[1].

بانگەوازی ئیسلام بانگەوازێكە ناكرێت كەسی ژێر ڕەدی بكاتەوە.

---

(١) وەرگیراوە لە تفسیر الإمام جلال الدین المحلي.

# سیفەتەکانی پێغەمبەر(صل الله علیە وسلم)

ئەو کەسەی وا دەزانێت باوەڕهێنان بە خەڵکی بە شمشێر ئەنجام دەدرێت، یان وازیان لە ئاینی خۆیان هێناوە بۆ ویستێکی دونیایی بوو، یان ترسانیان لە کارێکی دونیایی، ئەو کەسە کەسێکی خەیاڵ پڵاو و نەزانە.

ئەمە چ گەلێکە وازی لەو بەرنامەیە هێنا کە دڵی پێوەی پەیوەست بوو بەهۆی ترسێکی لەناکاو؟

ئەمە چ جیلێکە کە تەسلیم دەبێت و دەبێتە کارکەرێکی دڵسۆز بۆ خزمەتکردنی ئاینێکی نوێ تەنها بە شمشێر وەشاندنێك؟

ئەم بۆچونانەی کە بێباوەڕە نوێکان دەیخەنەڕوو بۆ بەهانە هێنانەوە بۆ گۆڕانی شارستانییەتەکانی زەوی لە ماوەی یەك جیلدا- جیلی هاوەڵان- بۆ ئیسلام، وە توانەوەی بیروباوەڕە کوفرییەکان لە دڵاندا بە بەڵگەی ڕاست، کۆمەڵە بۆچونێکە کە زیاتر خاوەنەکانیان تووشی خراپە دەکات لەوەی بیانپارێزێت لە کوفرکردنەکەیان.

خەڵکی مەکە و مەدینە و یەمەن و بەحرەین باوەڕیان بە محمد(صل الله علیە وسلم) هێنا کە درهەمێکیشی نەدا بە هیچ یەکێکیان، وە هیچ شتێکیشی نەبوو کە ئەو خەڵکەی پێ بترسێنێت.

جەلەندی پاشای عومان لە سەردەمی پێغەمبەر(صل الله علیە وسلم) مسوڵمان بوو، نە لە ترسی شمشێر بوو نە بۆ دەسەڵاتەکەی، بەڵکو مسوڵمان بونەکەی بۆ ئەوە بوو کە پەیامبەری خودا فرمان بە چاکە دەکات و خۆیشی ئەنجامی دەدات، وە ڕێگری لە تاوان دەکات و خۆیشی لێ بەدوور دەگرێت، جەلەندی دەڵێت( ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە ڕێگای نیشاندام بەوەی فرمانی بە چاکە نەدەکرد ئیلا خۆی یەکەم کەس بوو کە ئەنجامی دەدا، وە ڕێگای لە خراپە نەدەگرت ئیلا خۆی یەکەم کەس بوو کە وازی لێ دەهێنا...

وە بە وەفابوو بۆ پەیمانەكانی و بەڵێنەكانی بەجێ دەگەیاند و شاهیدی دەهێنم كە ئەو پێغەمبەرە[1]).. 

نەجاشی مسوڵمان بوو كە پاشای حەبەشە بوو كاتێك گوێی لێ بوو كە جەعفەری كوڕی ئەبی طالب- خودا لێی ڕازی بێت- كەمێكی لە سوڕەتی( المریم) خوێندەوە و وتی( بێگومان ئەمە و ئەوەی بۆ عیسا هات لە یەك چراخان دەردەچێت، پاشان گریا تا ڕدێنی تەڕبوو[2]).

بەڵام بازان خزمەتكاری كیسڕا لە یەمەن مسوڵمان بوو دوای ئەوەی موعجیزەیەكی زیندووی پێغەمبەری(صل الله علیه وسلم) بینی، ئەمەش بریتی بوو لەوەی پێغەمبەر هەواڵی دا بە نوێنەرەكانی بازان بە لە ناوچونی كیسڕا دوای ئەوەی كیسڕا پەیامەكەی پێغەمبەری خودای دڕاند، نوێنەرەكانیش باوەڕیان نەكرد و گەڕانەوە بۆلای بازان، بازانیش چاوەڕوانی هەواڵەكە بوو لە فارس، دوای چەند مانگێك هەواڵەكە هات بە كوشتنی كیسڕا لەو شەوەی كە پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) دیاری كردبوو، بازان مسوڵمان بوو، وە حكومەتەكەشی مسوڵمان بوون، بە مسوڵمان بونی وان خەڵكی یەمەن مسوڵمان بوو،

وەفدێك لە خەڵكی یەمەن هاتن كە فێری ئیسلام بن، ئەمە ئەو وەفدە بوو كە پێغەمبەر معاذی كوڕی جەبەلی لەگەڵ ناردن[3].

ئەو كەسەی وادەزانێت شمشێر بەرز كراوەتەوە بۆ مسوڵمانبوونی ئەم گەلانە، ئەو كەسە زۆر هیوا دوورە، بەڵكو شمشێر بەرز نەكراوەتەوە لە پێشدا تەنها لە ڕووی ئیسلام نەبێت، ئەو كەسانەی پێغەمبەریان بە درۆ خستەوە، بە هیچ شتێك سەرقاڵ نەبوون تەنها بەپیلان دانان بۆ ڕوخاندنی بانگەواز و كوشتنی پێشەواكەی بەهەر نرخێك بێت.

---

(١) وەرگیراوە لە الإصابة في تمییز الصحابة لابن حجر، و الشفاء للقاضي عیاض باب: فیما اظهرة الله تعالی علی یدیه من المعجزات و شرفه به من الخصائص و الكرامات.

(٢) اخرجه الإمام أحمد ١(٢٠٣)، وقال الهیثمي في مجمع الزوائد: رجاله رجال الصحیح.

(٣) البدایة و النهایة، جزء الثاني، ما آل إلیه أمر الفرس بالیمن.

بانگەوازی ئیسلام هەر لەسەرەتاوە توشی بەرەنگاری هاتووە، جارێك بەشمشێر و جارێك بە فێڵ و تەڵە، پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) دەربارەی پێغەمبەرانی پێش خۆی دەزانی کە زۆرێکیان کوژران، ئەمەش پەشیمانی نەکردەوە و وای نەکرد کە ئارامی لە دەست بدات، بەڵکو ئارامی گرت و دوعای کرد و چاکسازی کرد و ڕێکەوتننامەی کرد و نەرم بوو لەگەڵیان و دوعای بۆ کردن.

بە ژمارەیەکی کەم لە هاوەڵانی بۆ ماوەی سیانزە ساڵ لە نێو گەلێك مایەوە کە دەیانویست لە ڕەگەوە خۆی و هاوەڵانی دەربهێنن.

پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) بە ئاینێك هات بۆ لایان کە جیاوازە لە ئاینی باوك و باپیرانیان و خەونەکانیانی بە کەم دەزانی، لە کۆبونەوەکانیان قورئانی دەخوێندەوە کە باسی نەنگی وان و خوداکانیانی دەکرد.

لە کاتی حەجدا دەڕۆیشت بۆ ناو خەڵك و لە کۆبونەوەکانیان دادەنیشت و دەڕۆیشت بۆ لای سەرۆك هۆزەکان و بانگەوازی دەکرد بۆ یەکتاپەرستی کە پێغەمبەرانی پێش خۆی بانگەوازیان بۆی دەکرد و خەڵکی لە هاوبەش دانان ئاگادار دەکردەوە، لەگەڵ هەموو ئەمانەش قورەیش بۆی لە کەمین دابوون و بە پیاوەکانیان شوێنی دەکەوتن، وە ڕێگریان لە خەڵك دەکرد بۆ باوەڕهێنان بە بانگەوازەکەی، تەنانەت فرمانیان بە حاجیان دەکرد کە لۆکە بکەنە گوێیان تا گوێیان لە قورئان نەبێت کە پێغەمبەر دەیخوێندەوە تاوەکو عەرەبەکان بە قورئان کاریگەر نەبن[1].

وە بەردەوام تەڵەیان بۆ دانانەوە و هەوڵدان بۆ تیرۆرکردنی جار بە دوای جار، وە تەڵەیان بۆ هاوەڵانی دادەنایەوە و دەیانکوشتن و ئەشکەنجەی ئەو کەسانەیان دەدا کە بڕوایان بە پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) دەهێنا.

لە دۆڵەکانی ئەبی طالیب گەمارۆیان دان بۆ ماوەی سێ ساڵ، ماڵەکەیان گەمارۆدا و پیساییان فڕێ دەدا سەر شانی و هەموو فێڵێکیان بەکاردەهێنا {وَقَدْ مَكَرُوا مَكْرَهُمْ وَعِنْدَ اللَّهِ مَكْرُهُمْ وَإِنْ كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ الْجِبَالُ}[إبراهيم: ٤٦].

---

(١) هەروەك لە چیرۆکی مسوڵمان بوونی الطفیل بن عمرو الدوسي هاتووە، البیهقي في دلائل النبوة ٢١٠٨

واتە: قوڕەیش فێڵ و تەڵەکەیان نایەوە، وە هەموو فێڵ تەڵەکەکانیان لای خودایە و خودا پێی شاروزایە، هەرچەندە فێڵەکانیان ئەوەندە سەخت بوو کە کێوەکانیان پێ هەڵدەتەکاند، بەڵام خودا ئێوەی پاراست و ئێوەی سەرخست.

خزمەکانی پێغەمبەر داوایان لێی کرد کە بەرامبەر بە گەلەکەی قوڕەیش نەرمی بنوێنێت و بوەستێت لە ڕەخنە گرتن لە خوداکانیان و خەونەکانیان بە چاوێکی سووك سەیر نەکات، ئەویش زیاتر و بەردەوام ڕێبازی پوچی پوچەڵ دەکردەوە و ڕێبازی ڕاستی سەر دەخست[١].

ژیانی پێغەمبەر نەخشابوو بە دەوڵەمەندی و هەژاری و ئاشتی و ترس و دڵنیایی و مانەوە و کوشتنی خۆشەویست و پیاو چاکەکانی لە نێو دەستیدا، وە کافرەکان ئازاریان داوە بە گەمارۆدان و برسیکردن و زاڵ بوون بەسەری و هەوڵدان بۆ لەخشتەبردنی بە ماڵی دونیا و هەوڵدان بۆ کوشتنی، ئەو لە نێو کۆمەڵە ئەشکەنجە و ئازاردانێك دابوو کە هیچ پێغەمبەرێك وەك ئەو ئەشکەنجە و ئازاری نەچەشتوە[٢].

دەبێت مرۆڤ بپرسێت: بۆچی لەگەڵ ئەو ترس و ئەشکەنجەیەی کە توشی بوو لەسەرەتای بانگەوازییەکەی، لە بانگەوازی نەوەستا؟

لە شاری تائیف منداڵان لێیان دا تاوەکو سەر و پێی موبارەکی بەخوێن هات، هاتەوە بۆ مەکە لە ژێر پارێزی مطعم کوڕی عدي، کە دواتر داڵدەدانەکەی مطعمی ڕەد کردەوە، ڕیخۆڵەی حوشتریان کردە سەری، وە خۆی و شوێنکەوتوانی توشی ئەشکەنجەی برسیەتی و گەمارۆدان بوون بۆ ماوەی سێ ساڵ لە دۆڵەکانی مەکە تا وای لێهات دوو بەردی لە سکی دەبەست بەهۆی برسییەتی زۆرەوە.

---

(١) رسالة خاتم النبيين محمد صلى الله عليه وسلم، د. ثامر بن ناصر، مكتبة الرشد.

(٢) سەرچاوەی پێشوو.

پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) دەفەرموێت (لە پێناو خودای گەورە ئەوەندە ترسێنراوم کە کەس وەك من نەترسێنراوە، وە لە پێناو خودای گەورە ئەوەندە ئازارم چەشتوە کە هیچ کەسێك ئەوەندە ئازاری نەچەشتووە، ٣٠ ڕۆژم بەسەر تێپەڕیوە بە ڕۆژ و شەو نە من و نە بیلال خواردنێك نەبووە بیخۆین، جگە لەشتێکی کەم نەبێت کە بیلال شاردبویەوە[١]).

هەموو ئەمانەی بەسەر دەهات لە کاتێکدا کە کافران سەرکردایەتی و ماڵ و سامانیان پێ دەبەخشی، بۆ ئەوەنا کە واز لە بانگەوازییەکەی بهێنێت، بەڵکو لە بەرامبەر وازهێنان لە خۆیان و خوداکانیان و بیروباوەڕەکەیان پوچەڵ نەکاتەوە.

بەڵام بانگەوازییەکەی وەحی بوو بۆی دادەبەزی و لە خۆیەوە نەبوو تا وازی لێ بهێنێت بەرامبەر باشترین پێشنیارەکان کە لەم کاتەدا هەبوو، پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) بەرامبەر هەموو ئەم تاقیکردنەوانە بەهێزبوو و لە لۆمەی لۆمەکاران نەدەترسا.

بە درێژایی ژیانی بەرامبەر هەموو بەڵا توندەکان بە چەسپاوی مایەوە، ڕای نەکرد و شوێنی خۆی چۆڵ نەکرد، عەلی کەڕی ئەبی طاڵیب دەڵێت (ئێمە کە جەنگ گەرم دەبوو و چوار دەورمان سوور دەبوو، خۆمان بە پێغەمبەری خودا(صل الله علیه وسلم) دەپاراست، هیچ کەسێك هێندەی ئەو لە دوژمن نزیك نەبوو، لە ڕۆژی بەدر بینیمان کە ئێمە بۆ لای پێغەمبەر دەڕۆیشتین، ئەویش لە هەموومان نزیکتر بوو لە دوژمن[٢]).

بەندایەتیکرد و یادکردنەوەی خودای لە هەموو بارێك ئەنجام دەدا، شەونوێژی دەکرد تا پێیەکانی دەئاوسان، بەردەوام ڕۆژووی دەگرت و خێری بە هەموو ماڵەکەی دەکرد بۆ بنەماڵەکەی و دراوسێکانی، لە حاڵی هاوڕیکانی دەپرسییەوە، ئەمانە ئەو شتانەن کە لە فەرموودەکان باسکراون.

---

(١) رواه الترمذي في سننه ٢٤٧٢.

(١) رواه أحمد.

چۆن ئەقڵێك کە پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) پاکی کردوەتەوە دونیای تێ دەچێت، وە بێباوەڕان وای دەبینن کە پێغەمبەر داوای ماڵ و موڵکی دونیای کردووە بە شمشێر؟

بەکەم زانینی دونیا لە لایەن پێغەمبەرەوە(صل الله علیه وسلم) بەکەم زانینێك بوو کە لە هەبوونەوە بوو بەڵام خۆی دونیای نەویست نەك بەکەم زانینێك کە لە نەبوونەوە بێت، پێغەمبەر تێر نانی جۆ نەبوو بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەسەر یەك تاوەکو ماڵ ئاوایی لە دونیا کرد[١].

مانگێك و دوو مانگ تێ دەپەڕی هیچی نەدەخوارد جگە لە خورما و ئاو[٢].

پێغەمبەر لەسەر جێگای نەرم نە نوست، عبدالله ی کوڕی مەسعود ڕۆژێك هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(صل الله علیه وسلم) کە شوێنەواری حەسیر لەسەر لایەکی لاشەی دەرکەوتبوو، ئەویش بۆ حاڵی محمد گریا.

پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) وتی: چی دەتگریەنێت ئەی عبدالله؟

عبدالله وتی: ئەی پێغەمبەری خودا کیسرا و قەیسەری ڕۆم لەسەر حەریر دەخەون، پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) وتی: مەگری ئەی عبدالله دونیا بۆ ئەوانە و دواڕۆژیش بۆ ئێمەیە، نمونەی من و دونیا وەك ڕێبوارێك وایە کە لە ژێر سێبەری دارێك دادەنیشێت و پشویەك دەدات و جێی دەهێڵێت[٣].

پێغەمبەر لەسەر پێستێکی خۆشکراو دەنوست، وە مرد و قەڵغانەکەی بە ڕەهن لای یەهودییەك بوو[٤]، چونکە قەرزاری یەهودیەك بوو و قەڵغانەکەی بە ڕەهن لای یەهودیەکە بوو.

---

(١) رواه البخاري ٤٩٥٥.

(٢) متفق علیه.

(٣) متفق علیه: أخرجه الخارى ٤٩١٣، و مسلم١٤٧٩، واللفظ من: الزهد لابن أبي عاصم ١، ٢٠٠.

(٤) متفق علیه: أخرجه البخاري ٢٩١٦، ومسلم ١٦٠٣.

كاتێك بێباوەڕان تۆمەتباری دەكەن بەوەی پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) داوای دونیای كردوە، بزانە كە ئەوان هیچ لە ژیاننامەی ئەو نازانن.

دەربارەی بەزەیی پێغەمبەر بۆ گەلەكەی، سەیری گێڕانەوەی معاویەی كەڕی حەكەمی سەلەمی بكە كە دەڵێت: كاتێك نوێژم دەكرد لەگەڵ پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) پیاوێك پژمی لە نێو خەڵكی، منیش وتم(یرحمك الله)، خەڵكەكەش بە چاو سەیریان كردم و سەركۆنەیان كردم، منیش وتم: دایكتان لەدەست بدەن! چیتانە سەیری من دەكەن؟

ئەوانیش بەدەست لە ڕانیان دا، كاتێك بینیم هەوڵی بێ دەنگ كردنم دەدەن، منیش بێ دەنگ بووم.

كاتێك پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) دایك و باوكم بە قوربانی بێت نوێژەكەی ئەنجامدا، هیچ مامۆستایەكم نەبینی نەلەپێش ئەو و نە لە دوای ئەو كە فێركردنی لەو باشتربێت، فەرمووی (ئەو نوێژە دروست نییە قسەی خەڵكی تێدا بكرێ، بەڵكو بریتییە لە ئەنجامدانی زیكری خودا و بە گەورە زانینی و خوێندنەوەی قورئان[1]).

كەسێكی دەشتەكی پۆشاكەكەی توند ڕاكێشا بە شێوەیەك كە شوێنەواری لەسەر ملی بەدیار كەوت، دەشتەكیەكە وتی: ئەی محمد لەو ماڵ و سامانەی خودا كە لای تۆیە پێم ببەخشە، ئەمە نە ماڵی تۆیە و نە ماڵی باوكتە.

پێغەمبەریش بە ڕویدا ئاوڕی دایەوە و پێكەنی و فرمانی كرد پێی ببەخشن[2].

پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) كەسێكی حەكیم بوو لە چارەسەركردنی كارەكان، بەردەوام موژدە دەربوو، خوڕەوشتی سادە بوو، ڕویەكی لێ بوردەی هەبوو، زمانی بەكاردەهێنا بۆ بەدیهێنانی ڕاستی و پوچەڵكردنەوەی چەوتی، خاوەن ڕوحێكی بەخشندە بوو، وەڵامی داوای بەندەكانی دەدایەوە و لەگەڵ كەسانی توشبوو بە گولی نانی دەخوارد و خۆی بزنەكی دەدۆشی و خزمەتی خۆی دەكرد.

---

(١) رواه مسلم ٨٤١.

(٢) أخرجه النسائي ٤٧٧٦، و ابو داود ٤٧٧٥.

پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) حیکمەت و زانستێکی زۆری هەبوو، زانستێکی گشتگیری هەبوو لەهەموو بابەتێکی دینی و دونیایی، لە کاتێکدا ئەو نەخوێندەوار بوو و لە ژینگەیەکی نەخوێندەوار بوو.

پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) نێردرا بە باشترین کیتاب بۆ باشترین گەل بە باشترین شەریعەت[1].

قورئان کە دابەزی نە بەپێوەری ئەو دابەزی نە بەپێوەری سروشتی ئەو ناوچەویەی کە لێی دابەزی، وە نە بەویستی نزیکەکانی و نە هاوڕێکانی، بەڵکو قورئان دابەزی بە ڕەخنەگرتن و ڕاستکەرەوە و شیکەرەوە و مامۆستا و هیدایەت دەر.

ئەو کەسانەی بانگەواز بۆ خۆیان دەکەن و دەیانەوێت پلەیان بەرز بێتەوە لە سەر زەوی بەپێی توانا هەوڵ دەدەن کە نەنگیەکانیان بشارنەوە بۆ داپۆشینی ڕاستی خۆیان لە خەڵکی، بەڵام بۆ پێغەمبەر چەندان ئایەتمان هەیە کە هەڵویستی پێغەمبەر ڕاست دەکەنەوە یان ڕەخنەی لێ دەگرن وەك: سەرەتای سورەتی عبس و التحریم و ئەو ئایەتانەی کە دابەزین لەسەر دیلەکانی جەنگی بەدر.

وە ئەگەر سەیر بکەین کە چەندین جار پێویستی زۆری بە دابەزینی وەحی هەبوو بۆ بەستنی زمانی هاوبەش دانەران و گومان دروستکەران، وە هەندێك ئایەت زۆر دوا دەکەوت، کە ئەگەر ئەم قورئانە لای خۆی بوایە دوا نەدەکەوت، درود و سەلامی خودای لەسەر بێت.

لە کۆتاییدا: خودای گەورە هەواڵی دا بەسەرکەوتنی پەیامەکەی، وە هەواڵی دا بە پێشەوایەتی کردنی ئاینەکەی و بڵاوبوونەوەی، لە ماتێکدا ئاینی عەرەبەکان بوونی هەبوو وە پاشاکانیان دەسەڵاتیان هەبوو بەسەر هەموو دورگەی عەرەبیدا، وە موڵکەکانی هیند و کیسڕا و قوستەنتنیە کە عەرەب خەونیشیان پێ نەدەبینی، چ جای بڵاوبونەوەی هێزیان لە نێو ئەماندا.

جیلی سەردەمی پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) چونە نێو دەریا و ڕۆمیان دەرکرد لە میسڕ و شام و زەوی مەغریب.

---

(٣) رسالة خاتم النبيين محمد صلى الله عليه وسلم، د. ثامر بن ناصر، مكتبة الراشد.

عەرەبەكان لە پێش ئەمە گاڵتەیان پێی دەكرد كاتێك دەیان بیست ئەم پیاوە سەردەكەوێت و ناحەقی پوچەڵ دەكاتەوە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەوی، وە عەرەبەكان سەركەوتنی ئەویان دادەنا بە نمونەی ڕوخاندنی چیا بەرزەكان بە پەڕێكی فڕیو[١].

بەڵكو خودا هەواڵی داوە بەسەر كەوتنی پێغەمبەرەكەی و بڵاوبونەوەی ئاینەكەی ڕاستییەكە و دێت، ئەو كەسەی وادەزانێت كە پێچەوانەی ئەمە ڕوودەدات با خۆی هەڵبواسێت بۆ نەمانی ڕقەكەی {مَنْ كَانَ يَظُنُّ أَنْ لَنْ يَنْصُرَهُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى السَّمَاءِ ثُمَّ لْيَقْطَعْ فَلْيَنْظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُ مَا يَغِيظُ}[الحج: ١٥] واتە: هەر كەسێك وادەزانێت كە خودا یارمەتی پەیامبەرەكەی نادات لە دونیا و قیامەت و سەری ناخات، با گوریسێك لە بنمیچی خانوەكەی جێگیر بكات و خۆی هەڵبواسێت و خۆی بخنكێنێت، ئینجا با بزانێت كە ئاخۆ ئەو هەموو ڕق و قینەیەی دەڕوات؟

چەندین ئایەت هەواڵی سەركەوتنی پێغەمبەری(صل الله علیه وسلم) هینا بێ هیچ گومانێك، ئەمەش بە تەواوی ڕویدا.

---

(١) سەرچاوەی پێشوو.

## هەندێك لە نیشانەكانی پێغەمبەرایەتی محمد(صل الله علیه وسلم)

پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) هەواڵی داوە بە چەندین شتی سەیر و ڕوودانی چەندین ڕووداوی پەنهان، كە ڕوویدا هەروەك هەواڵی دا.

ئەم ڕووداوانە بەڵگە بوون بۆ ڕاستگۆیی خاوەن پەیام و پشتگیری كردنی لەلایەن خوداوە.

پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) هەواڵی دا بە دایكی حەڕام كچی مەلحان كە كەسانێك لە گەلەكەی دەچنە دەریا بۆ غەزاكردن لە پێناو خودا، وە ئەمیش دەبێتە یەكەم شەهیدەكانی غەزا لە دەریا، بەم شێوەیەش ڕوویدا كە پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) هەواڵی دا[1].

ئەوە بوو چوو بۆ دەریا لەگەڵ سوپای مسوڵمانان لەسەردەمی خەلیفایەتی عوسمانی كوڕی عەفان-ڕەزای خودای لێبێت-كە مرد بەشەهیدی و لەوێدا نێژرا، وە مزگەوتی أم حرام لە قوبرس ناسراوە تا ئەم ڕۆژەمان[2].

پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) هەواڵی دا كە شەڕ دەكەین لەگەڵ تورك كە چاویان بچووكە و دەم و چاویان سوورە و لو تیان بچووكە و بەرزبووەتەوە، دەم و چاویان وەك شوێنی پیاكێشتنی چەكوش وایە؛ زانای پایەبەرزی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەڵێت( ئەم كۆمەڵانە هەموویان موسوڵمانان جەنگیان لەگەڵ كردوون، ئەمانە تەتەرەكانن و ئەمانەش سیفەتەكانیانن[3].

---

(١) متفق علیه: البخاري ٢٦٣٦، ومسلم ١٩١٢.

(٢) أعلام النساء، عمر رضا كحالة، أم خزات بن ملحان.

(٣) الجواب الصحیح ٢، ٨١

وە هەواڵی دا بەڕووداونی هەڵگەڕانەوە، لەگەڵ ئەوەی ئەمە بە تەواوی دوور بوو لەسەر دەمی خۆی، وەخەڵکی بۆ ئایین دەهاتن بە کۆمەڵ، خەڵکەکە پشتیان لێکرد و جێیان هێشت هەروەك هەواڵی دابوو[1].

وە پێغەمبەر(صل الله علیە وسلم) هەاڵی داوە بەشەهید بوونی عمر و عوثمان عەلی و طلحة و زوبێر -خودا لێیان ڕازی بێت- وە ئەوان نامرن لەسەر جێگاکانیان یان بەو شێوەیەی کە خەڵکی دەمرن، هەرواش ڕوویدا کە هەواڵی دا.

پێغەمبەر(صل الله علیە وسلم) ڕۆژێك سەرکەوتە سەر چیای حەڕاء لەگەڵ أبوبکر و عمر و عثمان و عەلی و طلحة و زوبێر، بەردێك جولا، پێغەمبەر فەرمووی: لەسەر خۆبە، تۆ کەست لەسەر نییە جگە لە پێغەمبەر و ڕاستگۆ و شەهید نەبێت[2].

پێغەمبەر(صل الله علیە وسلم) شایەدی دا بۆ خۆی بە پێغەمبەرایەتی و بۆ أبوبکر بە ڕاستگۆیی و بۆ عمر و عثمان و عەلی و طلحة و زوبێر بە شەهیدی.

ڕۆژێك ئیمامی عەلی تووشی نەخۆشییەکی کوشندە بوو، أبو سنان الدؤلي سەردانی کرد، پێی ووت: ئێمە لەو نەخۆشییەت ترساین ئەمیری باوەڕداران.

ئیمامی عەلیش پێی ووت: بەڵام سوێند بە خودا من لێی نەترسام، چونکە گوێم لە پێغەمبەری خودا(صل الله علیە وسلم) ڕاستگۆی ڕاستگۆیان بوو، وتی: تۆ بێگومان لێدانێکت بەردەکەوێت لێرە، لێدانێکیش لێرە- ئاماژەی بۆ خەنافسی کرد- کە خوێنی لەبەر دەڕوات تا ڕیشت تەڕ دەبێت، وە ئەو کەسەی کە لێت دەدات نەگریس ترین کەسە، هەروەك چۆن ئەو کەسەی کە حوشترەکەی سەربڕی نەگریس ترین کەسی ثمود بوو، ئەمەش بەسەر ئیمامی عەلی- ڕەزای خودای لێبێت- ڕوویدا[3].

---

(١) رواه مسلم ١١٤.

(٢) رواه مسلم ٢٤١٧.

(٣) رواه الحاكم (٣،١٢٢)، و طبراني في الكبير ١٧٣، وقال الهيثمي: اسناده حسن.

فاطمەی کچی پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) دەڕۆیشت، کە پێغەمبەری توش بوو، باوکی پێی ووت: سلاو لە کچەکەم بێت، دایکی باوەڕداران عائیشە دەڵێت: پاشان پێغەمبەر داینیشاند لە لای ڕاستی یان چەپی، پاشان بە نهێنی قسەی لەگەڵ کرد، گریا، پاشان پێغەمبەر بە نهێنی قسەی لەگەڵ کرد، پێکەنی.

منیش پێم ووت: نەم بینیوە هیچ ڕۆژێك وەك ئەمڕۆ کە دڵ خۆشبێت و دڵ تەنگ بێت، منیش پرسیارم لێی کرد لەوەی کە پێغەمبەر پێی فەرمووە؟ ئەویش وتی: من نهێنی پێغەمبەری خودا ئاشکرا ناکەم، کاتێك کە پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) کۆچی دوایی کرد پرسیارم لێی کرد، ووتی: پێغەمبەر بە نهێنی پێی وتم: جوبڕیل هەموو ساڵێك جارێك قورئانی لەگەڵ خەتم دەکردم، ئەم ساڵ دووجار لەگەڵی خەتم کردم، منیش ئەمە بەهیچ نابینم جگە لە هاتنی کاتی مردنم نەبێت، وە تۆش یەکەم کەسی کە لە خزمەکانم پێم دەگەیت، منیش گریام، پێغەمبەریش(صل الله علیه وسلم) وتی: ئایا ڕازی نیت ببیت بە گەورەی ئافرەتانی بەهەشت یان گەورەی ئافرەتانی باوەڕداران، منیش بۆ ئەمە پێکەنیم[1].

وە لەو کەسانەی کە پێغەمبەر باسی مردنی کردوون، نەوەکەی حوسێنی کوڕی عەلی ڕەیحانەی خەڵکی بەهەشت، پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) بە یەکێك لە خێزانەکانی دەڵێت( فریشتەیەك هات بۆ لام کە هەرگیز پێشتر نەهاتووە بۆ لام پێی وتم: ئەو کوڕەت حوسێن دەکوژرێت، ئەگەر بتەوێت خۆڵی ئەو زەویەت پیشان دەدەم کە لێی دەکوژرێت، پێغەمبەر فەرمووی: فریشتەکە خۆڵێکی سووری دەرهێنا[2]).

---

(١) متفق علیه: البخاري ٣٦٢٤، ومسلم ٢٤٥٠.

(٢) السلسلة الصحیحة ٨٨٢.

.

پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) هەواڵی دا بە مردنی نەجاشی لە خاکی حەبەشە لە ڕۆژی مردنەکەی، ئەم هەواڵە سوارچاکەکان لەم کاتەدا بە ماوەی مانگێك دەیان هێنا، ئەبی هورەیرە دەڵێت (پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) هەواڵی مردنی نەجاشی دا لەو ڕۆژەی کە تیایدا مرد، چوو بۆ شوێنی نوێژکردن، خەڵکی کۆکردەوە، وە چوار الله اکبری کرد[1]).

ڕۆژێك بەر لە جەنگی بەدر، پێغەمبەر (صل الله علیه وسلم) سەیری شوێنی جەنگی چاوەڕوانکراوی دەکرد، وە ئاماژەی دەدا بە شوێنی مردنی هاوبەش دانەران، دەیگوت ئەمە شوێنی مردنی فلانە).

ئەنەس وتی: پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) دەستی لەسەر زەوی دادەنا لێرە لێرە، هیچ یەکێك لە هاوبەش دانەران لانەچوون لە شوێنی دەستی پێغەمبەر[2].

لەو شتە سەرسوڕ هێنەرانەی کە ڕوویدا، پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) هەواڵی دا بە سەرەنجام خراپی پیاوێك کە لەگەڵ مسوڵمانان دەجەنگا، زۆر بەباشی هەوڵی دەدا و دەجەنگا، ئەبی هورەیرە دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خودا بووین، پیاوێك کە بانگەشەی مسوڵمان بوونی دەکرد، پێغەمبەر وتی: ئەم پیاوە لە کۆمەڵەی دۆزەخییەکانە.

ئەبی هەرەیرە دەڵێت: کاتێك کە کاتی جەنگ هات ئەم پیاوە جەنگی کرد، جەنگێکی زۆر توند، تووشی برینداری بوو، وتیان ئەی پێغەمبەری خودا: ئەو کەسەی کە پێت وت( ئەو پیاوەی لە کۆمەڵەی دۆزەخییەکانە)، ئەم پیاوە ئەمڕۆ جەنگا، زۆر بە توندی جەنگا و مرد.

پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) وتی: بۆ ئاگر.

ئەبی هورەیرە دەڵێت: خەریك بوو هەندێك لە خەڵکی تووشی گومان دەبوون، کاتێك لەم باسانەدا بوون، هەندێك لە خەڵکی وتیان: ئەم پیاوە نەمردووە بەڵام برینێکی سەختی هەیە.

---

(١) رواه البخاري ١٢٥٤.

(٢) رواه مسلم ١٧٧٩.

کاتێك کە شەو داهات، ئارامی لەسەر برینەکەی نەگرت، خۆی کوشت، هەواڵیان بە پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) دا ئەویش وتی: الله اکبر، شایەدی دەدەم من بەندەی خودا و نێردراوی ئەوم، پاشان فرمانی بە بیلال کرد کە بەخڵکی ڕابگەیەنێت ( بێگومان هیچ کەسێك ناچێتە بەهەشت تەنها کەسی مسوڵمان نەبێت، وە بێگومان خودا ئەم ئایینە سەر دەخات بە پیاوی ستەمکاریش[1]).

پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) هەواڵی کوژرانی کەسێکی درۆزنی دا کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد لەسەر دەستی پیاو چاکێك!

ئەم بەسەرهاتە لە بوخاریدا هاتووە، پێغەمبەر وتی: ئەم شەو پیاوێکی چاك لە قەومێکی چاکەکار الأسود العنسي کوشت.

بەم شێوەیەش لەم شەوەدا الأسود العنسي لەناو چوو لەسەر دەستی فیروز الدیلمي.

پرسیاریان لە پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) کرد دەربارەی مانەوەی ڕۆم، ئەویش وتی: ڕۆژی دوایی دێت و ڕۆمەکان زۆرترینی خەڵکن[2].

ڕۆم گەلێکی ناسراون بە مەسیحییەکان ئەمڕۆ زۆرترینی خەڵکن[3].

ئەگەر ورد بیتەوە لە فەرموودە ڕاستەکان کە هەواڵدان و موعجیزەکانی تێدا هاتووە، دەبینیت کە فەرموودەی موتەواتری تێدایە کە گومانی پیاوێك ناهێڵێت کە بەدوای ڕاستی دەگەڕێت لە گێڕانەوەی فەرموودەکان.

---

(١) رواه البخاري ٣٦٠٢.

(٢) رواه مسلم ٢٨٩٨.

(٣) ڕۆم زۆرترینی خەڵکی سەر زەوین، ژمارەیان بە نزیکەیی ٢،٢ ملیار نفوسە، دواتر مسوڵمانان ١،٦ ملیار.

http:// en.wikipedia,org/wiki/List_of_ religious_population.

بۆ نموونە: فەرموودەی گریانی كۆڵەگەی دار خورما بۆ تامەزرۆیی محمد(صل الله علیه وسلم) وە گوێ لێبوونی هاوەڵان لە گریانەكەی تا پێغەمبەر باوەشی پێدا كرد ئینجا بێ دەنگ بوو، ئەمە فەرموودەیەكی موتەواترە و هاوەڵێكی زۆر شایەدی بوون،

لە كیتابەكانی فەرمووده ١٠ هاوەڵ ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە بۆسەدان تابیعین، ئەم فەرموودەیەش لە بەرزترین پلەی سەحیحەكانی فەرموودەیە[١].

فەرموودەی پەنابردنی وشتر بۆ لای پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) كە شەكوای ئەشكەنجەدانی لە لایەن خاوەنەكەی دەكرد و چاوەكانی فرمێسكیان لێ دەهات، فەرموودەیەكی موتەواترە و كۆمەڵێك لە هاوەڵان بۆ سەدان تابیعینیان گواستوەتەوە[٢].

دەربارەی موعجیزەی دوو كەرت بوونی مانگ، ئەویش لە فەرموودە موتەواترەكانە، وە پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) سوڕەتی (القمر)ی لە كۆبوونەوە گەورەكانی وەك جەژن و هەینی دەخوێندەوە تا خەڵكی ئەو موعجیزانەیان گوێ لێبێت كە لەم سوڕەتەدا هەیە، وە ئەم ڕوداوەی دەكردە بەڵگە بۆ ڕاستی پێغەمبەرایەتییەكەی.

ئیبن كەثیر دەڵێت( مسوڵمانان كۆك بوون لەسەر دوو كەرت بوونی مانگ لەسەردەمی پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم)، چەندان فەرموودەی موتەواتر هاتوون بە چەندین ڕێگەی جیاواز كە جێگای ملكەچ بوونە بۆ ئەو كەسەی كە ئەم هەواڵەی پێگەیشتووە و سەیری كردووە[٣].

فەرموودەی هەڵقوڵانی ئاو لە نێوان پەنجە موبارەكەكانی پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم)، ئەم فەرموودەیەش لە موتەواترەكانە كە كۆمەڵێكی زۆر لە هاوەڵان شاهیدی بوون و گواستویانەتەوە بۆ سەدان و هەزاران تابیعین،

---

(١) الشفا بتعريف حقوق المصطفى، القاضي عياض، ص٢٠٦.

(٢) رواه مسلم٣٤٢، وأبو داود٢٥٤٩، وأحمد١٧٤٥، والحاكم ٢- ١٠٩.

(٣) انظر البداية و النهاية ٣- ١١٨.

هەزار و پێنج سەد هاوەڵ لەم ئاوە دەست نوێژیان گرت و لێیان خواردەوە كە لە نێوان پەنجە موبارەكەكانی پێغەمبەر دەرچوون، وە هاوەڵان وتیان ئەگەر سەد هەزار كەس بواین بەشی دەكردین[1].

فەرموودەكە كۆمەڵێكی زۆر گێڕاویانەتەوە كە درۆ بە حەرام و خراپە دەزانن، جا چۆن هەموویان كۆك دەبن لەسەر درۆ لە هەواڵێكی لەم شێوەیەدا؟

رحمت الله الهندي- خودا لێی ڕازی بێت- دەڵێت( هەڵقوڵانی ئاو لە نێو پەنجەكانی پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) لە چەندین شوێن ڕویداوە، ئەم موعجیزەیەش گەورەترە لە هەڵقوڵانی ئاو لە نێو بەرد وەك ڕوویدا لەگەڵ موسا-علیه السلام-، ئەمە سرووشتی بەردە بە گشتی، بەڵام هەڵقوڵانی ئاو لە نێو گۆشت و خوێن جگە لە پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) لە هیچ كەسێكی تر نەزانراوە[2].

دەربارەی زیاد بوونی خۆراكێكی كەم تا سوپایەكی گەورە لێی بخوات، ئەوا چەندین هەواڵی موتەواتر هاتووە لە هاوەڵانەوە بۆ كەسانی دوای ئەوان، تەنها بۆخاری باسی ئەم هەواڵەی كردووە لە پێنج شوێن لە سەحیحەكەی[3].

وە سڵاوكردنی بەرد لە پێغمبەر(صل الله علیه وسلم) و زیكركردنی خۆراك لە نێو دەستەكانی و لەرینەوەی چیا لە ترسی ئەو، هەواڵانێكن كە هەردوو شەیخەكە[4] گێڕاویانەتەوە و لەسەر ڕاستی هەاڵەكان كۆكن[5].

---

(١) فتح الباري ١- ٥٤٠.

(٢) إظهار الحق، رحمت الله الهندي ص٣١.

(٣) البخاري ١٢١٧، البخاري٢٦١٨، البخاري٣٥٧٨، البخاري ٤١٠١، البخاري ٦٤٥٢، هەموو ئەمانەش كۆمەڵە ڕووداوێكی جیاوازی ڕوونكەرەوەن، ئەمانەش تەنها لە بوخاریدا.

(٤) الشیخان: ئیمامي بوخاري و مسلم (وەرگێر).

(٥) عبداللهی كوڕی مەسعود دەڵێت: گوێمان لە دەنگی تەسبیخاتكردنی خۆراك بوو كاتێك دەخورا- لە نێو دەستەكانی پێغەمبەردا- صل الله علیه وسلم-، البخاري ٣٥٧٩.

هەموو ئەم فەرموودانە موتەواترن کە گومان لە ئەقڵی بە درۆ خەرەوەی ئەم فەرموودانە دروست دەکات، وە تاوانباری ڕەد کەرەوەی فەرموودەکان دەکات، هیچ گێڕانەوەیەکی جێ بڕواتر نییە و هیچ موعجیزەیەکی گەورەتر نییە لەم فەرموودانە کە پێغەمبەرایەتییەکەی(صل الله علیە وسلم) دەسەلمێنن بە بەرزترین پلەی پێغەمبەرایەتی.

ئەو کەسەی دڵنیایە کە عیسا لای خودا هاتووە یان موسا پێغەمبەر بووە، دواتر کوفر دەکات بە پێغەمبەرایەتی محمد(صل الله علیە وسلم)، ئەو کەسە درۆزنترین دروستکراوە!

بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی محمد پەڕاوەکان ناتوانن کۆی بکەنەوە، لە هەموو سەردەمێك بەڵگەیەکی نوێ دەکرێتەوە بۆ زانایان کە ڕێگای چاو کراوان ڕووناك دەکاتەوە.

.

# بەشی سێیەم

## دیاردەی قوڕئانی تەحەدای بێباوەڕان دەکات

دیاردەی قرئان لە ناوچەیەکی بیابانی لە نێو گەلێکی گەورە دۆزرایەوە، کە بۆ چەندین سەدە خەڵکی کردە پێشەنگ کە هەرگیز نەدەهاتنە نێو مێژوو ئەگەر هەستانەوەی ئەم دیاردە قورئانییە نەبوایە.

## دیاردەی قورئان تەحەدای بێباوەڕان دەكات

هیچ كتێبێك نییە خودای بە پاك ڕاگرتبێت وبە پیرۆزی زانیبێت وفرمانی یەكتاپەرستی كردبێت و پێغەمبەرانی بە ڕاست دانابێت و ئەوانی بە پاك ڕاگرتبێت لە هەموو كەم و كورتییەك، وە هانی خەڵكی بدات بۆ ئەنجامدانی كاری چاك وەك قورئان لەو كاتەوەی كە دونیا هەیە تاوەكو ئێستا.

قورئان چنراوە بە یەكتاپەرستی و پێغەمبەرایەتی و غەیب و حیكمەت و فیقھ و یاسا دانان و ڕەوشت، هەموو ئەمانە بە چنینێكی زمانەوانی كە عەرەب نموونەی وای نەبینەیوە[١].

چەندین ملیۆن قینطاڕ[٢] لە زێڕ و زیو خەرجكراوە بۆ سڕینەوەی قورئان نەهێشتنی كاریگەرییەكەی لە نێو دڵان، و پەرتەوازەكردنی شوین كەوتوانی و تێكدانی مەبەستەكانی بە درێژایی مێژوو، بە هیوای ئەنجامدانی ئەو كارەی كە بە كیتابەكانی پێش ئەو كراوە.

قورئان لەگەڵ هەموو ئەم هەوڵانە مایەوە بە ئاڵا بەرزی و پاراستنی دەستوورەكانی.

{إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ لِيَصُدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ ۚ فَسَيُنْفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَالَّذِينَ كَفَرُوا إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ}[الأنفال: ٣٦] واتە: بێگومان ئەو كەسانەی كە كافر بوون ماڵ و سامانی خۆیان خەرج دەكەن بۆ بەرگرتن لە پەیام و ڕێگەی ڕاستی خودا، ماڵ و سامانەكەیان خەرج دەكەن و پاشان دەبێتە مایەی خەم و پەژارە بۆیان پاشان تێك دەشكێن و ژێر دەكەون، وە ئەو كەسانەی كە كافر بوون بۆ دۆزەخ ئەبردرێن و حەشر دەكرێن.

---

(١) الرسالة خاتم النبيين محمد صلى الله عليه وسلم، د.ثامر بن ناصر، مكتبة الرشد.

(٢) قینطار: یەكەیەكی پێوانەییە كە یەكسانە بە ١٤٣.٨ كیلۆ گرام (وەرگێڕ).

ئەگەر سەیری ئاینی مەسیحییەكان بكەیت دەبینیت گشت یاساكانیان ئاڵ و گۆڕ كراوە و گۆڕاوە و نوێ كراوەتەوە، عیسا- علیە السلام- كەنیسەی نەدەناسی چ جای ئەوەی بنیادی بنێت، چ جای ئەوەی یاسای بۆ دابنێت، ە زەنگ و خاچ و سوجدە بردن بۆ قەشەكان و وێنەی قەشەكان و پلەكانی كەنیسە و دوعا كەهنوتیەكانی نەدەزانی، لەو ئینجیلەش كە ئەمڕۆ لە نێو دەستی مەسیحیەكانەی ئەمانەی تێدا نییە!

ئەمانە كۆمەڵە شەریعەتێكن كە خودا نەی ناردووە.

ئەگەر سەیری تەوراتیش بكەیت دەبینیت كاركردن پێی گرانە، بەشێوەك یەهودییەكان لەسەر خۆیان گران كرد كە توانایان بەسەری نەما، سرووتەكانی پاك بوونەوە و پیسی لای ئەوان پێویستی بە قوربانی و گۆشەگیری تەواو هەیە لە ژیان.

یاساكانی تەورات پەیوەستە بە هەیكەلی سولەیمان پێغەمبەر- علیە السلام- و سەربڕگە -شوێنی قوربانی كردن-، هەیكەلەكە وێران كراو كەس شوێنی نازانێت، سەربڕگەش ڕوخێنرا و ئاسەواری نەماوە، ئەمەش بەڵگەیەكی ڕوونە بۆ لە كارخستن و پوچەڵ بوونەوەی ئاینەكە.

دەربارەی هیندۆسەكان كە لە چیاكانەوە خۆیان فڕێ دەدەنە خوارەوە و لاشەی مردوو دەسوتێنن و خۆیان لە ئاودا نوقم دەكەن بۆ پاك بوونەوە، زۆر دوور نەكەوتونەتەوە لە تقوسی جوولەكە، ئەگەر خودا بیویستبا بۆ پاكبوونەوە لە ناویان ببات، ڕێگای نەدەدان پۆشاك دروست بكەن بۆ خۆپاراستن لە بەڵا و نەهامەتی، وە پۆشاكی پێ نەدەبەخشین كە لە گەرما بیان پارێزێت[1].

بۆیە زانای پایە بەرزی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەڵێت( نە لە تەورات و نە لە ئینجیل نمونەی واتاكانی قورئان نییە.

نە لە ڕاستی، نە لە چۆنیەتی، نە لە ڕێژە

---

(١) الإعلام بمناقب الإسلام، أبو الحسن العامري، ص١٣٧.

بەڵکو جیاوازی هەیە بۆ کەسێك کە بکۆڵێتەوە لە قورئان و کیتابەکانی تر[١]).

قورئان نامەیەکی ئاسانە بۆ هەموو گەلان، ئیمامی جلا الدين المحلي- ڕەحمەتی خودای لێبێت- لە تەفسیرەکەی بۆ ئایەتی{وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ}[الأعلى: ٨] دەڵێت: (لليسرى) واتە: بۆ شەریعەتێکی ئاسان کە بریتییە لە ئیسلام.

ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ واتای وشەکانی قورئان دەبینیت بێ سنوورە، وە زانیارییەکانی نە گۆشەگیر کراوە و نە ژمێردراوە.

بەڵکو فراوانە بۆ هەموو هونەرێك.

ئیمامی ئالوسی دەفەرمویت( تۆ لە کیتابی خودا هواڵەکان و یاساکان و ئامۆژگارییەکان و پەندەکان و ڕەوشتەکان و ئادابەکان دەبینیتەوە، وە بەخشین و ترساندن و پیاهەڵدانی پیاو چاکان و سەرکۆنەکردنی تاوانبارن، وە قوڵبوونەوە لە سیایەتەکان و گفتەگۆی بەرامبەر و بەڵگە هێنانەوە لەسەر بنچینەی باوەڕ و لانی گومان، باسکردنی غەیب و باسکردنی جیهانی ئاسمان و زەوی، هەموو ئەمانە دەرهێنراوە بە ڕێکخستنێکی ڕێکتر لە هەموو شێوازێك، نە لە ئەراجیزی[٢] دەشتەکیەکانە و نە لە هۆنراوە عەرەبییەکانە، هەتا قورئان دووبارە ببێتەوە خۆشتر دەبێت، وە ناوبانگەکەی لەهەر بونێکی تر بەرزترە، بە نزیك خستنەوەی مانا گۆڕدراوەکانی دەتگوازێتەوە لە بەڵێن دان بۆ ترساندن و لە ڕابردوو بۆ ئێستا و داهاتوو، لە حیکمەتەوە بۆ گفتوگۆ، هاودژ نییە و بێ ڕێکخستن نییە، بەڵکو واتاکانی یەکدەگرن لە ڕێکخستنێکی داهێنەرانەدا[٣].

---

(١) الجواب الصحيح ٥- ٤٣٥.

(٢) ئەراجیز: جۆرێکە لە گۆرانی، کە عەرەبە دەشتەکییەکان لای وشترەکان لە بیابان دەیڵێن.

(٢) الدلائل العقلية، الآلوسي، مخطوط.

موعجیزەی قورئان تەنها لە ڕەوانبێژی نییە وەك هەندێك لە بێباوەڕان بۆی دەچن

نە لە وشەكانیەتی بە تەنها

نە لە واتاكانییەتی بە تەنها

بەڵكو ئیعجازی قورئان وشە و واتا و ڕەوانبێژی دەگرێتەوە، وە دەگوازێتەوە بۆ زانست و یاساكان و حیكمەتەكان و گەڕان بە دوای خود و بنچینەی مرۆڤ و تێركردنی ویستەكانی.

زانای پایە بەرز ئیبن تەیمیە دەڵێت( موعجیزە لە ماناكانی قورئان زۆر

گەورەتر و زیاترە لە موعجیزە لە وشەكانی، هەموو زاناكانی گەلان دەستە وەستانن لە هێنانی مانایەكی وەك قورئان بە دەستەوەستانێكی زیاتر لە عەرەبەكان بۆ هێنانی نموونەیەكی قورئان بەهەمان وشەكان[1]).

سەیری كۆتا دەربڕینی بكە دەڵێت: هەموو زاناكانی گەلان دەستە وەستانن لە هێنانی مانایەكی وەك قورئان بە دەستەوەستانێكی زیاتر لە عەرەبەكان بۆ هێنانی نموونەیەكی قورئان بەهەمان وشەكان).

قورئان دەستە وەستانكەرە و بەردەوامیش دەستە وەستانی خەڵك دەكات، قورئان بە وشەكانی و بە ماناكانی و زانیارییەكانی و هونەرەكانی و زانستەكانی ناوی دەستە وەستانكەرە، هیچ عەرەبێك نەیتوانیوە نموونەیەكی وەك قورئان بێنێت لە وشەكانی لە قورئان بچێت و هیچ كەسێك لە گەلانی تر نەیانتوانیوە نموونەیەك بێنن لە واتادا وەك قورئان بێت، ئەنجامنەدانی ئەم كارە لەگەڵ ئەوپەڕی پێویستیان پێی دەبێتە هۆی ئەوەی هیچ كەسێك توانای هێنانی نموونەیەكی وەك قورئانی نەبێت.

---

(١) الجواب الصحیح ٥-٤٣٤.

موعجیزەی ڕەوانبێژی قورئانی بە هۆی ئەم هۆکارانەیە:-

بە ڕەوانترین وشە هاتووە

بە جوانترین ڕێکخستن هاتووە

لە خۆگرتنی ڕاستترین مانا.

بۆ هەر وشەیەك لە قورئان ئەگەر وەریگریت و لە هەموو زمانی عەرەبی بگەڕێیت بۆ هێنانی وشەیەکی باشتر، ناتوانیت[1].

وە ئەگەر بتەوێت دانراوێك دابنێیت بە کۆمەڵە وشەیەك جگە لە وشەکانی قورئان کە یەکسانی قورئان بێت لە باشی دانراوەکە و ڕێکخستنی و ڕەونەقی شایەدی بۆ سەرکەوتنی قورئان دەدەیت و دەستە وەستانی خۆشت بۆ دەردەکەوێت.

سەیری کورتبڕی وشەکان و وردبینی ماناکانی و ڕێك کەوتنی وشەکانی بکە لەم وتەیەی خودای گەورە{وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ وَيَا سَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ ۖ وَقِيلَ بُعْدًا لِلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ}[هود ٤٤] واتە: وە بەزەی وترا کە ئاوەکەت قوت بدەرەوە و وە ئەی ئاسمان چیتر ئاو مەڕێژە، ئاوەکە بەخێرایی کەم بوویەوە و فرمانی خودا بەسەر گەلی نووح جێبەجی بوو و کەشتییەکەش لەسەر کێوی جودی جێگیر بوو، جا گوترا: با ئەم گەلە شتەمکارە لە ڕەحمەت و بەزەیی خودا دووربن.

وە سەیری کورتبڕی دەستە وەستانکەر بکە لەم وتەیەی خودای گەورە{فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ}[الصافات ١٠٣] واتە: کاتێك پێغەمبەر ابراهیم و اسماعیلی کوڕی ملکەچی فرمانی خودا بوون و ابراهیم اسماعیلی بە ڕووداخست.

وە مانای وشەی{ فَلَمَّا أَسْلَمَا} کاتێك گوێڕایەڵ بوون بۆ فرمانی خودا { وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ} وە پێغەمبەر ئیبراهیم ئیسماعیلی بە ڕوودا خست بۆ سەر زەوی و هەموو مرۆڤێك دوو خەنافسی هەیە لە نێوانیان نێو چەوان هەیە،

---

(١) رسالة خاتم النبيين محمد صلى الله عليه وسلم، د.ثامر بن ناصر، مكتبة الرشد.

ئەمەش بە مانای ئەمە دێت کە چەقۆکەی لەسەر قوڕگی دانا، بەڵام چەقۆکە نەیبڕی بە فرمانی خودا[1].

ئایا دەتوانیت ئەم مانا داواکراوە بێنیت بە هەمان ژمارەی وشە لە چوارچێوەیەکی ڕەوانبێژی کە جیاوازی نەبێت لە شێوازی ئایەتەکانی پێش و ئایەتەکانی دوای خۆی؟

ئەگەر لە زمانی عەرەبی بگوازیتەوە و بتەوێت وشەیەکی وەك { أَنُلْزِمُكُمُوهَا} وەرگریت لە ئایەتی{ قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِنْ كُنْتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّي وَآتَانِي رَحْمَةً مِنْ عِنْدِهِ فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ أَنُلْزِمُكُمُوهَا وَأَنْتُمْ لَهَا كَارِهُونَ}[هود ٢٨].

وشەکە وەردەگێڕیت دوای ئەوەی وشەکە پارچە پارچە دەکەیت کە جوانییەکەی لە دەست دەدات و دەبێتە حەوت وشە لە زمانی ئینگلیزی Shall we compel you to accept it.

پەیوەست بوونی وشەکانی قورئان بە یەکتر و وەرگرتنی مانای تەواو لە چەندان نموونەدا هەیە، سەیری وشەی{ فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ} بکە لە ئایەتی{ وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ وَمَا أَنْتُمْ لَهُ بِخَازِنِينَ}[الحجر ٢٢] لە یەك وشەدا (حرف عطف، فعل، فاعل، مفعول الأول، مفعول الثاني) هەیە.

بۆیە کاتێك عەرەب گوێیان لە کیتابی خودا دەبوو بە ڕوونی گوێیان بۆی شل دەکرد بەهۆی بەهێزی کاریگەرییەکەی و ڕەونەقداری ڕەوانبێژییەکەی، جبير بن مطعم لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە کاتێك گوێی لەم وتەیەی خودای گەورە بوو{ أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ(٣٥) أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ ۚ بَلْ لَا يُوقِنُونَ(٣٦) أَمْ عِنْدَهُمْ خَزَائِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ الْمُصَيْطِرُونَ}[الطور ٣٥-٣٧] دەڵێت: خەریك بوو دڵم دەفڕی[2].

---

(١) تفسير الجلالين للآية.

(٢) صحيح البخاري ٤٥٠١.

هەموو ئەمانە دڵنیامان دەكەنەوە كە قورئان نەهاتووە تەنها بۆ تەحەدا كردن و چاكردنی خەڵك و ڕێنوێنی كردن نەبێت.

تا ئێستاش قورئان تەحەدای هاوبەش دانەرە ڕەوانبێژەكان دەكات بە توندترین تەحەدا، خەون و خەیاڵەكانیان بەكەم دادەنێت و سەركۆنەی خودا كانیان دەكات، وە تەحەدایات دەكات كە نموونەیەكی وەك قورئان بێنن یان وەك یەك سوڕەت، ئەمانیش لەگەڵ هەموو ئەمانەدا دەستە وەستانن لە بەرهەڵستی كردنی.

خودای گەورە دەربارەی هاوبەش دانەران دەڵێت{ فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا وَلَنْ تَفْعَلُوا}[البقرة ٢٤] واتە: ئەگەر هیچتان بۆ نەكرا و هیچیشتان بۆ ناكرێت بەرامبەر قورئان.

نە ئەنجامیانداوە و نە توانایان هەیە، وە هەر كەسێك بەم كارە هەڵسابێت لە گەمژەكانیان وەك موسەیلەمە فێڵەكەیان بۆ خەڵكی دەركەوتووە، وە خەڵك پشتیان تێكردوون[١].

مرۆڤ بۆی هەیە بپرسێت: چۆن پیاوێك دەتوانێت تەحەدای كەسانێك بكات لە بابەتێك كە خۆیان لێی زۆرباشن وە داهێنانی تێدا دەكەن، پاشان بۆ چەندین ساڵ جێیان دێڵێت وە ئەوانیش شەرمەزاری و بێدەنگیان بەسەر زاڵ دەبێت؟

د. عبدالله الدراز دەڵێت: ئایا پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) نەدەترسا گەرم و گوڕی ئەدیبەكان بوروژێنێت؟

خۆیان بۆ بەربەرەكانێ ئامادە بكەن و ئەوانیش كۆمەڵەیەكی وریا بوون، پێغەمبەر (صل الله علیه وسلم) دەیتوانی چی بكات ئەگەر كۆمەڵەیەك لە ڕەوانبێژەكانیان ڕێكەوتبان كە یەكێكیان شێوازێكی پێچەوانەی دانابا، پاشان ئەوانی تر چاك كاری و ڕێكخستنیان تیادا كردبا وەك چۆن وایان دەكرد بۆ ڕەخنەگرتن لە هۆنراوە، كەسی دواتر كەم و كوڕی كەسی پێش خۆی چاك دەكرد، وە بەم شێوەیە بەردەوام بوان.

---

(١) الشفاء للقاضي عیاض ١-٣٥٦، بە دەستكارییەوە.

تا وشە گەلێکیان دەردەهێنا ئەگەر سەرنەکەوتبان بەسەر تەحەداکە ئەوا کەمتر نەدەبوو ئەگەر لەچەند لایەنێکیشەوە بێت.

پاشان ئەگەر خۆی بەخشی و ئەم بڕیارە بدات بەسەر خەڵکی سەردەمی خۆی، ئەی چۆن دەیدات بەسەر جیلەکانی دوای خۆی تا ڕۆژی قیامەت، بەڵکو تەحەداکە بۆ مرۆڤ و جنیش بێت؟

ئەم سەرکەشیە، پیاوێك پێی هەڵناسێت تەنها کەسێك نەبێت کە دڵنیا بێت لە هەڵسوڕانی کارەکانی بونەوەر، وە هەواڵی ئاسمانی لابێت، بەم شێوەیە ئەم تەحەدایەی داناوە بە ئاشکرا بۆ هەموو جیهان، ئەمە بڕیارێکە گەڕانەوەی بۆ نییە، هیچ کەسێك بەرهەڵستی نەکرد ئیلا گەڕاوەتەوە بە دەستە وەستانێکی دیار، و سەرنەکەوتنێکی ئابڕوبەر، بەدرێژایی سەردەمەکان[١].

قورئان تەحەدای کۆمەڵی خاوەن زانیاری کرد بە دەستەواژەی شەرمەزارکەر، بۆ هێنانی یەك سورەتی وەك قورئان، ئەنجامیان نەدا، هەموو عەرەب و گەلانی تریش کە ئەم تەحەدایەیان بۆ گواستراوەتەوە نەیان توانیوە نمونەی وەك قورئان بێنن، تا بیاوەڕان و کەسانی تریش پێی بحەسێنەوە.

ئیمامی الآلوسي- ڕەحمەتی خودای لێبێت- دەڵێت: هیچ یەکێك لەمان تا ئەمڕۆ بەژێر لێویش گوێی نەکردووە و هیچ شتێکیشی ڕوون نەکردوەتەوە دەربارەی وەسفکراوێك یان وەسفێك، وە هەرهەموویان دەستەوەستانیان دەرخستووە بۆ بەرەنگاربونەوەی قورئان لە هەموو کات و ساتێکدا، بەڵکو تا خودا زەوی و ئەوەیشی لەسەریدایە وەریدەگرێتەوە، وە هەر خوداش باشترین وەرگرەوەیە.

ئەمە وەك ئەوە وایە محمد(صل الله علیه وسلم) لە هەموو سەردەمێك بوونی هەبێت لە نێومان و وەحی ش نەبڕابێت، چونکە بەڵگەی پێغەمبەرایەتییەکەی خەڵکی باسی دەکەن بۆ ڕاستی پێغەمبەرایەتییەکەی لە هەموو شار و وڵاتان بەشەو و ڕۆژ[٢].

---

(١) النبأ العظيم، د. عبدالله الدراز رحمه الله، ص ٤٤-٤٥.

(١) الدلائل العقلية للآلوسي، مخطوط.

ئەم کەسانەی کە قورئان تەحەدایان دەکات بینیان کۆکردنەوەی سوپا و دروستکردنی کۆمەڵەکان بۆ جەنگ کردن لەگەڵ پێغەمبەری خودا(صل الله علیه وسلم) ئاسانترە لە بەرەنگاربوونەوەی قورئان قەبوڵکردنی ئەم تەحەدایە.

ئەم تەحەدایە لە هەوڵدانی ئەوان زیاترە بۆیە خودا لەسەر زاری ئەوان پێمان دەڵێت { وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَٰذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ}[فصلت ٢٦] واتە: کافرەکان دەڵێن گوێ لەم قورئانە مەگرن و هەرا و هۆسە درووست بکەن بۆ ئەوەی سەرکەون بەسەر محمد(صل الله علیه وسلم).

کاتێك طفیل بن عمرو الدوسي هات بۆ مەکە کە شاعیرێکی تێگەیشتوو بوو- سەرۆك هۆزی دەوسی بوو لە یەمەن- خەڵکی مەکە پێشوازیان لێکرد و وەك سروشتی خۆیان ئاگاداریان کردەوە لە گوێ گرتن لە قورئانی محمد(صل الله علیه وسلم) تا پەلکێشی سیحرەکەی نەبێت، تا گوێی بە لۆکە داپۆشی کاتێك هات بۆناو مزگەوتی حەڕام.

بەڵام وا دەرکەوت کە ئەو توشی گومان بوو لە خۆی لەم ڕێگایە پڕوپوچە، بەخۆی وت: من ئاقڵم و شاعیرم، جوان و ناشیرینم لێ ون نییە، لۆکەکەی لابرد لە گوێی و کەمێك گوێی لە قورئان گرت، دڵی دەستی بەسەردا گرت و مسوڵمان بوو شایەدی ڕاستی بەخودا هێنا.

گەڕاوە بۆلای هۆزەکەی و بانگی کردن بۆ ئیسلام و لەڕێگەی گەڕانەوەی ڕووناکیەك دەرچوو لە گۆپاڵەکەی وە بەم ڕووناکییە چوە ناو شارەکەی و هۆزەکەی مسوڵمان بوو، نزیکەی هەشتا ماڵ لە هۆزەکەی مسوڵمان بوون، ئەمانەش بوون کە دواتر شادبوون بە پێغەمبەری خودا(صل الله علیه وسلم) لە مەدینە[(١)].

کاریگەری قورئان لەسەر فیترەت و نەفسی مرۆڤ سەرسوڕهێنەرە، قورئان چیای ڕق و قینە دەتوێنێتەوە و دڵەکان ڕووناك دەکاتەوە لە گێژاویدا، وە ئەقڵەکان بەرەو خۆی و وشەکانی پەلکێش دەکات.

---

(١) دلائل النبوة للأبهاني ١-٣١٢، سيرة ابن هشام ١-٣٨٢.

ئافرەتان و منداڵان قەرەباڵغییان دروست دەکرد لە دەوری ماڵی ئەبوبەکر لە سەرەتای بانگەوازی کاتێك کە قورئانی دەخوێند بەهۆی توندی پەلکێش بونیان وکاریگەربونیان.

بوخاری لە سەحیحەکەی دەگێڕێتەوە( پاشان ئەبوبەکر مزگەوتێکی لە تەنیشت ماڵەکەی دروست کرد کە شوێنێکی دیاربوو، لە نێویدا نوێژی دەکرد و قورئانی دەخوێند، ئافرەتان و منداڵانی هاوبەش دانەران قەرەباڵغییان لێی دروست دەکرد و سەیریان دەکرد و تووشی سەرسامی دەبوون، ئەبوبەکرد پیاوێك بوو زۆر دەگریا و فرمێسکی پێ ڕانەدەگیرا کاتێك قورئانی دەخوێند، ئەمەش پیاو ماقوڵانی هاوبەش دانەرانی دەترساند[1]).

زاڵبوونی قورئان بەسەر دڵان سەیرە، دڵنیایی دەچێنێت لە دڵێك کە ژەنگی گرتووە و باوەڕ دەچێنێت لە کافرێکی قینە لە دڵ.

خودای گەورە ئێمەی لەم ڕاستییە ئاگادار کردووەتەوە لەم ڕاستییە و فرمانی پێ کردووین بە بەکارهێنانی کاریگەری قورئان لەسەر دڵان، هەوڵی داوین کە کافر لە نێو دەنگی جەنگ و توندبوونی بەیەکدادانی شمشێر چاوەڕوانی چاکەی لێ دەکرێت کاتێك گوێی لە قورئان دەبێت{ وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْلَمُونَ}[التوبة ٦].

واتە: ئەگەر هەرکەسێك لە هاوبەش دانەران پەنای بۆ هێنایت، تۆش پەنا و داڵدەی بدە، تا بەباشی گوێی لە قورئان دەبێت و تێی دەگات، پاشان بیگەیەنە شوێنێکی هێمن و ئاسودە، چونکە ئەوانە گەلێکن نازانن ئیمان و باوەڕ چییە، بەڵکو بەو پەنادانە بیر بکەنەوە و مسوڵمان بن.

پاکی و بێگەردی بۆ خودا!

---

(١) البخاري ٢٢٩٧.

چۆن کافر دەشکێت لە کاتی توندبوونی جەنگ بۆ دەنگی کیتابی دوژمنەکەی؟

ئەمە لە نهێنییەکانی قورئانە.

چەندان دوژمنی پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) ویستیان تیرۆری بکەن، هەر کە گوێیان لە ئایەتەکانی قورئان بوو دڵیان ڕاچڵەکی و باوەڕ لە چاوەکانییان پەنگی دایەوە.

قورئان دەسەڵاتێکی زاڵی هەیە بەسەر نەفسەکان و بەردەوام ڕەگێکی تەڕە بۆ شوێن کەوتوانی بەم یاسا و شەریعەتانەی کە هەیەتی، وە هاوڕێی نزیکی خەڵوەتە و نەفسەکان بەرەو لای دەڕۆن لەکاتی کێشەدا و دڵ تەنگی لادەبات لەهەر شوێنێك کە تیایدا بدۆزرێتەوە، { اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُّتَشَابِهًا مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَنْ يَشَاءُ ۚ وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ}[الزمر ٢٣] واتە: خودای گەورە باشترین فەرموودەی ناردووە کە قوئانە، کە کیتابێکە هەمووی لە جوانی و ڕەوانبێژی لەیەك دەچێت، پەند و ئامۆژگاری و فرمان بە حەڵاڵ و ڕێگری لە حەرامی تێدایە، لە کاتی بیستنی هەڕەشەکانی، پێستی ئەو کەسانەی لە خودا دەترسن گرژ دەبێت، پاشان پێست و دڵیان بۆ یاد و بەزەیی خودا نەرم دەبێتەوە، ئەم قورئانە ڕێنوێنی خودایە دەیدات بەهەر کەسێك کە خودا بیەوێت ئەم ڕینمونییەی پێ دەبەخشێت و هەرکەسێکیش خودا گومڕا و سەرلێشێواوی بکات هیچ کەسێك نییە ڕینموونی بکات.

نەفسەکان بۆ کیتابی خودا شاد دەبن و دڵەکان پێی دەکرێنەوە تا بەشی خۆیان لێی دەبەن و دەگەڕێنەوە بە دەوڵەمەندی کە تووشی دوو دڵی بوو بوو[1].

---

(١) رسالة خاتم النبيين محمد صلى الله عليه وسلم، د.ثامر بن ناصر، مكتبة الرشد.

کاتێك وەلیدی کوڕی موغیرە لە پێغەمبەرەوە(صل الله علیه وسلم) گوێی لە وتەی خودای گەورە دەبێت کە دەفەرموێت{ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَالْبَغْيِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ}[النحل ٩٠].

وەلید دەڵێ( سوێند بە خودا ئەم وتەیە شیرینی تێدایە و بەڕەنگی جوان نەخشێنراوە، ژێرەوەی بەخشش و خۆشییە و سەرەکەشی بەرهەمدارە و ئەمە وتەی مرۆڤ نییە) دڵی نەرم بوو و وتی: سوێند بەخودا ئەمە لە هیچ لەو وتانە ناچێت کە ئێمە دەیڵێین.

بۆیە دەنگی نێردراوانی عەرەب کۆك بوون بۆ ئەوەی گوێ لە قورئان نەگرن و خێزانەکانیشیان گوێی لێ نەگرن، ئەمە تاکە ڕێگایە بۆ بەرگریکردن بەرامبەر تەحەدای هێنانی نموونەیەکی وەك قورئان، چۆن عەرەب تەحەدای کیتابێك بکەن کە بە ڕەوانترین و بەرزترین شێوە دابەزی لە زمانی عەرەبی لە ڕەوانی وشە و وردی دانانی و ڕێکخستن و کۆکردنەوەی وشە.

هەموو ئەمانە و پێغەمبەر محمد(صل الله علیه وسلم) نەخوێندەوار بوو، خوێندنەوە و نوسینی نەدەزانی { وَمَا كُنْتَ تَتْلُو مِنْ قَبْلِهِ مِنْ كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ}[العنكبوت ٤٨] واتە: تۆ پێش ئەم قورئانە هیچ کیتابێکت نەخوێنوەتەوە و هیچیشت نەنوسیوە، چەنکە ئەگەر خوێندەوار بوایەیت ئەوا ناهەق بێژەکان گومانیان لە تۆ و قورئان دەکرد.

کەسێك کە بیردەکاتەوە دەکرێ بپرسێت: چۆن محمد(صل الله علیه وسلم) دەتوانێت نموونەیەکی وەك ئەم کیتابە دانێت کە هەواڵی سەرەتاکان و مێژووی پێشینانی کۆکردوەتەوە؟

چۆن دەتوانێت دەستەواژەکانی قورئان ڕێکبخات و بەسەر نوسەرانی وەحی بیخوێنێتەوە بێ دووبارە ڕێکخستن و چاککردنەوەی؟

وە چۆن توانی ئەم ڕێگا و نموونانە ڕێکبخات کە قورئان بەهۆیەوە دابەزی؟

وە چۆن توانی ئایەتە دابەزیوەکان ڕێکبخات کە پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) فرمانی بە نوسەرانی وەحی دەکرد کە ئەم ئایەتانە لەم سوڕەتە دانێن

لەنێوان ئەم ئایەتە و ئەم ئایەتە، لە شوێنی خۆی دانێت لە نێو ئایەتی پێش و پاشی بێ ئەوەی لەگەڵ یەك نەگونجێ یان پێچەوانەی بێت،

بەڵكو وەك ئەوە وایە كە ئەم ئایەتانە بە یەك جار دابەزین و بە یەك پارچە[1]؟

پاكی و بێگەردی بۆ خودا.

تەحەدای قورئان تەنها پەیوەست نییە بە ڕەوانبێژییەكەی، وە تەنها پەیوەست نییە بە ڕوونكردنەوەی بنچینەكانی ئاین و بیروباوەڕی پێغەمبەرانی پێشین، و ڕانەوەستاوە لەسەر چاك كردنی ئەم گۆڕانكارییانەی كە درۆهەڵبەستەكان دروستیان كردووە.

بەڵكو تەحەدای قورئان هەموو ئەمانە تێ دەپەڕێنێت، وە هەموو ئەمانەش تێ دەپەڕێنێت كە دەربارەی نوسراون، وە ئەقڵی دۆستانی خودای بۆ دەكرێتەوە بۆ ئەو موعجیزانەی كە ئەم كیتابە لە خۆی گرتووە.

---

(١) د. عبدالله الدراز باسی ئەم بابەتە ناوازەیە دەكات لە كیتابی (المدخل الى القرآن الكریم)، دەڵێت ( لە كاتی دابەزینی قورئان هەندێك بابەت بە جیا دەهاتە خوارەوە و ئایەتەكان زۆر دەبوون و جیا دەبوونەوە، تاوەكو وردە وردە یەكەی سەربەخۆی دروست دەكرد دوای ئەوەی ئایەتی تری دەهاتە پاڵ كە لە دوای ئەم ئایەتانە دابەزین، وە هەندێك ئایەت لێرە زیاد دەكراو هەندێك ئایەتی تر دەچووە پاڵ ئایەتی تر، بەپێی فرمانی پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) كە ئەویش لە لایەن جوبریلەوە پێی دەگەیشت.

ئەگەر مێژووە نەژمێردراوەكان لەبەر چاومان دابنێین- مێژووی دابەزینی ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز- بەش بەشكردنە ناكۆتاكان لە دابەزینی ئایەتەكان، وە تێبینی ئەوەمان كرد كە ئەم وەحییە بە شێوەیەكی گشتی پەیوەست بوو بە بارودوخ و بۆنەی تایبەت، ئەمەش بانگێشتمان دەكات بۆ پرسیاركردن لە كاتی ڕێكخستنی هەموو سوڕەتەكان لەسەر شێوەی یەكەی سەربەخۆ.

وەك ئەوەی قورئان چەند پارچەیەكی جیاواز بێت لە باڵەخانەیەكی كۆن، وە بمانەوێت دووبارە نۆژەنی بكەینەوە لەسەر هەمان شێوەی خۆی، ئەگەر نا چۆن تەفسیری ئەم لەدوای یەكداهاتنە خێرایە و پرۆگرامسازییە دەكرێت لە یەك كاتدا كە لە زۆربەی سوڕەتەكاندا هەیە؟

بەڵام چ دڵنیاییەكی مێژوویی مرۆڤ بەهۆیەوە دەتوانێت ئەم پیلانە دانێت بۆ ڕووداوە داهاتووەكان، وە پێویستییە یاساییەكان و شیكردنەوە پێویستییەكانی، چ جای دەربارەی شێوەی ئەم زمانەی كە ئەم شیكردنەوانەی پێ ئەنجام دەدرێ، وە شێوازی بەكارهێنانی زمانەكەی لەگەڵ ئەم سوڕەتە بگونجێت نەك سوڕەتێكی تر؟

ئایا ئەوەمان بۆ دەرناكەوێت كە تەواوبوونی ئەم پلانە و جێبەجێ بوونی بە شێوەی خواستراو، پێویستی بە دەستوەردانی هێزێكی مەزن هەیە، كە توانای ئەم ڕێكخستنەی هەبێت) بە دەستكارییەوە.

تۆ غەیب گەلێك لە قورئان دەخوێنیتەوە کە ڕوو دەدەن بێ ئەوەی هیچ جیاوازی هەبێت لەگەڵ هەواڵەکەی قورئان.

وە هەواڵی گەلانێك دەخوێنیتەوە کە گەڕانەکانی ئەم سەردەمە هیچ شتێك زیاد ناکات جگە لە باوەڕهێنان بە ڕوودانی ئەوەی کە قورئان باسی کردووە.

وە شیکردنەوەی ناوازە دەخوێنیتەوە دەربارەی سروشتی نەفسەکان و هەواو ئارەزووەکانی و ئەو شتانەی کە بەرهەڵستی نەفس دەکەن و بەرپەرچی دەدەنەوە و دەیگەڕێننەوە باری ئاسایی خۆی، دەبینین بە تێپەڕبوونی ڕۆژەکان و سەیرکردنی حاڵی خەڵکی هەموو ئەمانە جێبەجێ دەبێت وەك ئەو شێوەیەی قورئان باسی کردووە.

ئەگەر بمانەوێت باسی هەموو ئەو شتە سەیرانە بکەین کە قورئان باسی کردووە ئەوا کاتمان بەش ناکات، ئەمانەش بۆ باسکردنی ڕوودانی هاتووە نەك بۆ تەحەدا کردن.

قورئان باسی مردنی هەندێك خەڵکی کرد بە دیاریکراوی لەسەر کوفر، ئەمەش ڕوویدا بێ ئەوەی هیچ یەکێك لەوان مسوڵمان ببن، ئەگەر هاتبا و هەریەك لەوان مسوڵمان بوایەن ئەوا پەیامی ئیسلام ڕاستەوخۆ کۆتایی دەهات.

**لەو کەسانە**

ئەبو لەهەب{ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ}[المسد ٣] واتە: دەخرێتە نێو ئاگرێکی بە بڵێسە.

وەلیدی کوڕی موغیرە{ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ}[المدثر ٢٦] واتە: دەیخەمە نێو سەقەڕەوە کە خراپترین شوێنی دۆزەخە.

بەڵکو قورئان هەواڵی داوە کە وەلیدی کوڕی موغیرە کوڕێکی زۆری پێبەخشراوە، وە ئەو ویستی زیاتریشی هەیە، بەڵام نا{ وَجَعَلْتُ لَهُ مَالًا مَمْدُودًا(١٢) وَبَنِينَ شُهُودًا(١٣) وَمَهَّدْتُ لَهُ تَمْهِيدًا(١٤) ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ(١٥)}[المدثر ١٢- ١٥] واتە: ماڵ ودارایی زۆرم پێبەخشی(١٢) وە کوڕانی هەمیشە ئامادە و لەبەردەست لە گەڵێ(١٣) وە دونیام بۆ ڕاخستبوو بە ڕاخستنێکی تەواو(١٤) پاشان هەر بەتەمایە بۆی زیاد بکەم(١٥).

البغوي- ڕەحمەتی خودای لێبێت- لە تەفسیری ئەم ئایەتانە دەڵێت: وەلید دوای دابەزینی ئەم ئایەتانە بەردەوام لە کەم بوونەوەی ماڵ و منداڵی بوو تا لە ناوچوو.

وە قورئان هەواڵی داوە بەهۆی زۆر کەلە ڕەقی و بەهۆی زۆری ڕێگری کردنی لە چاکە و زۆری گوناحەکانی و بوختانکردنی بۆ ئایەتەکانی خودا، بەهۆی هەموو ئەمانە بە شمشێر لە لووتی دەدرێت و بەمە دەناسرێتەوە{ مَنَّاعٍ لِلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ(١٢) عُتُلٍّ بَعْدَ ذَلِكَ زَنِيمٍ(١٣) أَنْ كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ(١٤) إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ آيَاتُنَا قَالَ أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ(١٥) سَنَسِمُهُ عَلَى الْخُرْطُومِ(١٦)}[القلم ١٢- ١٦] واتە: ڕژد و چرووکە لە بەخشینی ماڵ لە پێناو خودا و دەست درێژی گوناهبارە(١٢) بەد خوو و باوك نادیارە(١٣) لەبەر ئەوەی خاوەن دارایی و کوڕی زۆربوو(١٤) کاتێك ئایەت و نیشانەکانی ئێمەی بەسەر دەخوێندرایەوە، دەیگوت: ئەمە ئەفسانەی پێشینانە (١٥) بێگومان بەم نزیکانە لووتی ئەشکێنین و ڕیسوای دەکەین(١٦).

ئیبن عەباس دەڵێت: ئەمە لە ڕۆژی بەدر ڕوویدا- وەلید بە شمشێر لەسەر لووتی درا[١]-

بەڵکو قورئان بۆ ئاڕاستەیەکی زۆر مەزنتر دەگوازرێتەوە، لە سەرەتای بانگەواز دڵنیایی دەدات کە جەنگێك ڕوودەدات لە نێوان کۆمەڵەی محمد(صل الله علیه وسلم) و کۆمەڵەی هاوبەش دانەرانی قوڕەیش.

ئەمەش موعجیزەیەکی بنبڕە کە قوڕەیش بە ئاسانی مسوڵمان نابێت هەروەك شارە دوورەکانی وەك مەدینە و عومان و یەمەن و بەحرەین مسوڵمان بوون، بەڵکو چەندین جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوە ڕوو دەدەن، هەموو ئەمانە لەسەرەتای بانگەوازی بوو، هیچ کەسێك ناتوانێت پێشبینی بکات کە دوای چەند کاتژمێرێك چی دەبێت، چ جای چەند دەساڵێك لە کات.

خودای گەورە هەواڵی داوە بە تێکشکانی قوڕەیش بەر لە کۆچکردن{ سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ}[القمر ٤٥] واتە: لەمەوپاش کۆمەڵەکان -قوڕەیش- تێکدەشکێنرێن و بەرەوە دواوە هەڵدێن.

---

(١) سەیری تەفسیری (البغوي) بکە.

بەڵكو ئەم ئایەت و هەڕەشانە لە زۆربەی سوڕەتەكان دووبارە بووەتەوە كە لە سەرەتای بانگەوازی دابەزین، خودای گەورە دەفەرموێت{ قُلْ مَنْ كَانَ فِي الضَّلَالَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ الرَّحْمَٰنُ مَدًّا ۚ حَتَّىٰ إِذَا رَأَوْا مَا يُوعَدُونَ إِمَّا الْعَذَابَ وَإِمَّا السَّاعَةَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ مَكَانًا وَأَضْعَفُ جُنْدًا}[مريم ٧٥] واتە: ئەی پێغەمبەر بەو كەسانە بڵێ كە گومڕان با لەگومڕایی بژین و خودا تەمەنی درێژبكات و ماڵ و سامانی پێ ببەخشێ، تا ئەو كاتەی ئەم هەڕەشانە دەبینێت كە بەڵێنی پێدراوە، یاخود هەر لە دونیا سزاكەی دەبینن یان لە قیامەت، ئینجا دەزانن كێ خراپترین جێگای هەیە و كێش سوپا و لەشكری لاوازە.

ئەمە چ بینینێكی داهاتووە كە دڵنیایە كەلە ڕەقی ئەمانە درێژەی دەبێت تا جەنگ هەڵدەگیرسێت؟

ئەمە چ بینینێكی داهاتووە كە هەموو بانگەوازی لە ژێر سێدارەی پێشبینیكردن دادەنێت ئەگەر پیاو ماقوڵانی قوڕەیش مسوڵمان بووبایەن لە كاتی بانگەوازی مەكە ئەوا پێغەمبەرایەتی هەرەسی دەهێنا و بانگەوازی كۆتایی دەهات.

چەندان دەشتەكی و گوند مسوڵمان بوون بە ئاشتی و بێ جەنگ لە شەو و ڕۆژێكدا؟

چی دەبوو ئەگەر كافرانی قوڕەیش لەخەو هەڵسابان و مسوڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاندبا؟

بیربكەرەوە!

پاشان سەیركە چۆن كافرەكانی قوڕەیش سوپایان ئامادەكرد و هۆزەكانیان هێنا و ماڵ و پیاوانی خۆیان بەخشی بۆ جەنگان لەدژی بانگەوازییەك كە تازە دروست بوو بوو، وە بیریان لە بابەتێكی وەها نەكردەوە- نیشاندانی مسوڵمان بوونیان بە درۆ- كە خۆیان و منداڵەكانیانی ئاسوودە دەكرد بە درێژایی كات؟

ئەگەر قورئان وەحی نەبێت لەلایەن خوداوە كەسی ئاقڵ دەتوانێت چ لێكدانەوەیەكی تر بدات بۆ متمانەبوونی پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) بەوەی كەچی ڕوودەدات لە ڕۆژانی داهاتوو؟

هەروەها قورئان داوا لە جوولەکە دەکات کە هیوای مردن بخوازن، بەڵام ئەنجامیان نەدا{ قُلْ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ هَادُوا إِنْ زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَاءُ لِلَّهِ مِنْ دُونِ النَّاسِ فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ(٦) وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُ أَبَدًا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۚ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ}[الجمعة٦-٧] واتە:ئەی پەیامبەر(صل الله علیه وسلم) بڵێ بەو کەسانەی کە جوولەکەن، ئەگەر ئێوە بانگەشەی ئەوە دەکەن تەنها ئێوە دۆستی خودان و کەسی تر دۆستی خودا نییە، ئەوا ئاواتی مردن بخوازن ئەگەر ڕاست دەکەن(٦) وە هەرگیز ئاواتی مردن ناخوازن بەهۆی ئەو کارانەی ئەنجامیان داوە، وە خوداش زانایە بە کەسانی ستەمکار.

هەرگیز جوولەکە ئاواتی مردنیان نەخواست، چونکە دەزانن ئەگەر ئاواتی مردنیان خواستبا ڕاستەوخۆ دەمردن، لەگەڵ ئەوەی داواکارییان لێکرا بۆ وەڵامدانەوەی ئەم تەحەدایە.

قازی عبدالجبار دەڵێت( هیوای ئەمە ناخوازن لەگەڵ سووکی و ئاسانی و پێغەمبەر (صل الله علیه وسلم) دەیزانی کە خواستی زۆریان هەیە بۆ بەدرۆخستنەوە و ئابڕووبردنی، سەیرە؟

پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) نەی وت ئەم تەحەدایە لەلای منەوەیە، بەڵکو وتی ئەمە لەلای خودامە، خودای من و خودای ئێوەش کە نهێنی و ئاشکرای ئێوە دەزانێت، ئەم تەحەدایە زۆر توندترە بۆ جوولەکە لە تەحەداکردنی عەرەب بۆ هێنانی نموونەیەکی وەك قورئان، ئەمەش پلەیەکە پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) دەری ناخات تەنها بە دڵنیابوونەوە نەبێت.

بێباوەڕ و دوژمنانی پێغەمبەر توشی واق وڕماوی بوون بۆچی جوولەکە ئاواتی مردنیان نەخواست لە سەردەمی پێغەمبەری خودا(صل الله علیه وسلم) کە بەدرۆی بخەنەوە و بەمەش خۆیان ئاسوودە دەبن و خەڵکیش ئاسوودە دەبن[١].

---

(١) تثبيت الدلائل النبوة، القاضي عبدالجبار ٢-٤١١، بتصرف.

قورئان هەواڵی داوە بەسەرکەوتنی مسوڵمانان لە ڕۆژی بەدر پێش دەست پێکردنی جەنگ، وە ئەژمارکردنە مادییەکان لە سوودی کافرەکان بوو{ إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا ۚ سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ}[الأنفال ١٢].

واتە: کاتێك خودای تۆ - محمد(صل الله عليه وسلم)- وەحی نارد بۆ فریشتەکان کە یارمەتیتان بدەن و منیش لەگەڵتانم، وە باوەڕداران جێگیر بکەن، ترس دەخەمە نێو دڵی کافرەکان، لە ملیان بدەن و لەهەموو سەرە پەنجەیان بدەن.

ئیمامی السعدی- ڕەحمەتی خودای لێبێت- لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەڵێت( ئەمەش قسەکردنێکە بۆ باوەڕداران کە خودا هانیان دەدات، وە فێریان دەکات چۆن هاوبەش دانەران بکوژن).

قورئان هەواڵی داوە کە دووڕووەکان درۆ دەکەن لەگەڵ جوولەکەکانی بني نضير و سەریان ناخەن، خودای گەورە دەفەرموێت{ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِنْ قُوتِلْتُمْ لَنَنْصُرَنَّكُمْ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ(١١) لَئِنْ أُخْرِجُوا لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ وَلَئِنْ قُوتِلُوا لَا يَنْصُرُونَهُمْ وَلَئِنْ نَصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنْصَرُونَ(١٢)}[الحشر ١١-١٢] واتە: ئایا نابینیت کە ئەو کەسانەی دووڕوون دەڵێنە براکانیان کە کوفریان کردووە و خۆیان خاوەن کیتابی ئاسمانیین – جوولەکەکانی بني نضير- ئەگەر ئێوە لە مەدینە دەرکران ئێمە لێی دەردەچین لەگەڵ ئێوە، وە گوێڕایەڵی هیچ کەسێك ناکەین کە ببێتە زیان بۆ ئێوە، وە ئەگەر بجەنگن ئێمە سەرتان دەخەین، خوداش شاهیدە ئەوان درۆ دەکەن(١١) ئەگەر جوولەکەکان دەرکران لە مەدینە دووڕووەکان لەگەڵیان دەرناچن، ئەگەر جەنگاشن دووڕووەکان سەریان ناخەن، ئەگەر لەگەڵیشیان بێن بۆ جەنگ، لێی ڕادەکەن و سەریان ناخەن.

ئەمەش ڕوویدا کە خودا هەواڵی دابوو، جوولەکەکانی بني بضير چوون بۆ جەنگ و دووڕووەکان دەرنەچوون لەگەڵیان بۆ سەرخستنیان، بەڵکو جێیان هێشتن، جوولەکەکان جەنگیان کرد و دووڕووەکان سەریان نەخستن.

له‌ كۆتاییدا جووله‌كه‌كانی بني نضير ڕووبه‌ڕووی سه‌ره‌نجامی نا پاكییه‌كه‌یان بوونه‌وه‌ به‌ ته‌نها و هیچ یارمه‌تییه‌كیان پێ نه‌گه‌یشت له‌ دووڕووه‌كان!

ئه‌مه‌ش موژده‌یه‌ك بوو له‌ قورئان خۆییدا هه‌روه‌ك ئیبن كه‌ثیر- ڕه‌حمه‌تی خودای لێبێت- له‌ ته‌فسیری ئایه‌ته‌كه‌ ده‌یڵێت.

قورئان پێشبینی كردووه‌ به‌ شكستی فارس و سه‌ركه‌وتنی ڕۆم له‌ چه‌ند ساڵی داهاتوو، خودای گه‌وره‌ ده‌فه‌رموویێت{ فِي بِضْعِ سِنِينَ ۗ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ ۚ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ(٤) بِنَصْرِ اللَّهِ ۚ يَنْصُرُ مَنْ يَشَاءُ ۖ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ(٥)}[الروم ٤-٥] واته‌: ڕۆمه‌كان سه‌رده‌كه‌ون به‌سه‌ر فارسه‌كان له‌ چه‌ند ساڵێكی كه‌م، هه‌موو كاره‌كان لای خوداوه‌یه‌ له‌ پێشدا و له‌ دوایشدا، له‌و ڕۆژه‌شدا باوه‌ڕداران دڵخۆش ده‌بن(٤) به‌سه‌ركه‌وتنێك له‌لایه‌ن خوداوه‌، خودای گه‌وره‌ هه‌رلایه‌نێك بیه‌وێت سه‌ری ده‌خات، هه‌رئه‌ویشه‌ خاوه‌ن ده‌سه‌ڵاتداری به‌ به‌زه‌یی.

له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی مێژوو له‌م كاته‌دا كۆتایی ڕۆمی ده‌نوسییه‌وه‌، و هه‌ڵمه‌ته‌كانی ئاپروێزی فارسی هه‌موو هیواكانی ڕۆمی بۆ سه‌ركه‌وتن تێك شكاند، ته‌نانه‌ت ئاپروێز خاچی خاچه‌كانی برد وه‌ك سوكایه‌تی كردن به‌ ڕۆم!

له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌شدا و له‌كاتێكی مێژوویی یه‌كلاكه‌ره‌وه‌ هێرقل هه‌ڵده‌ستێته‌وه‌ و سه‌ر ده‌كه‌وێت به‌سه‌ر ئاپروێز له‌ جه‌نگێكی یه‌كلاكه‌ره‌وه‌ و ئایه‌ت و موعجیزه‌كه‌ دێته‌ دی[1].

قورئان هه‌واڵی داوه‌ له‌ ڕۆژی سه‌ركه‌وتنی ڕۆم به‌سه‌ر فارس مسوڵمانانیش سه‌رده‌كه‌ون{ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ(٤) بِنَصْرِ اللَّهِ}[الروم ٤-٥]، به‌م شێوه‌یه‌ش هه‌واڵی سه‌ركه‌وتنی ڕۆم له‌ جه‌نگی به‌دری گه‌وره‌ هات[2].

وه‌ قورئان سینه‌ی هاوه‌ڵه‌ به‌ڕێزه‌كانی فێنك كردەوه‌ و دڵیانی ئارام كرده‌وه‌ به‌وه‌ی كه‌ ده‌چنه‌ ناو مزگه‌وتی حه‌ڕام،

---

(1) http://www.angelfire.com/nt/Gilgamesh/sasanian.html.

(٢) سه‌یری ته‌فسیری (البغوي) بكه‌ بۆ ئایه‌ته‌كه‌.

ئەمەش دوای ئەوە دێت کە هاوبەش دانەران ڕێگریان لێکردن لەوەی بچنە ناو ماڵی خودا، خودای گەورە دەفەرموویێت{ لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِنْ دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا}[الفتح ٢٧] واتە: خودای گەورە خەونی پەیامبەرەکەی بە ڕاست گێڕا و هێنایەدی، کە دەچنە ناو مزگەوتی حەرام بە یارمەتی خودا بە بێ ترس و سەرتان دەتاشن و کورتی دەکەنەوە و لەکەس ناترسن، جا خودای گەورە ئەو شتانەی ئەزانی کە ئێوە نەتاندەزانی، ئینجا پێش چونە ناو مەکە سەرکەوتنێکی تریشی هێنایە پێشتان.

د. عبدالله الدراز- ڕەحمەتی خودای لێبێت- باسی ڕووداوێکی سەیر دەکات، دەڵێت (مسوڵمانان ڕێگرییان لێ کرا لە چوونە ناو مەکە لە ساڵی ڕێك کەوتنی حودەیبیە، وە قوڕەیش مەرجیان لەگەڵ کردن کە ساڵی داهاتوو ئەگەر هاتن ئەبێت بێنە ناو مەککە بە دابڕاندنیان لە هەموو چەکێك جگە لە شمشێری نێو کالان نەبێت، ئایا دەیانتوانی متمانە بە وەفای قوڕەیش بکەن بەرامبەر پەیمانەکەیان کە پەیمان شکاندن و پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی و دەست درێژی کردن بۆ دروشمەکانی خودایان لێ تاقی کردوونەتەوە؟

ئایا ئەمڕۆ ڕێگریان لێ نەکردن لەوەی کە ئاژەڵەکانییان بکەن بە قوربانی؟

ئایا بەیانی چی دەکەن؟

ئەگەر ئەمانیش هەوڵیاندا کە مسوڵمانان بڕوا پێ بهێنن بەوەی بچن بۆ نێو مەکە، چۆن مسوڵمانان لە خۆیان دڵنیا دەبن کە بچن بۆ ناو مەکە لە تەنیشت کافران بە داماڵراوی لە قەڵغانییەکان و هێزیان، ئایا نەدەترسان لەوەی کە ئەمە فێڵێك بێت بۆ پەلکێشکردنیان بۆ نێو تەڵە؟

بەڵگەی ئەمەش بە مەرجگرتنی داماڵینیان لە چەك تەنها شمێری نێو کالان نەبێت، ئەمەش چەکێکە مسوڵمانان لەوانەیە دڵنیابن کە قوڕەیش ناتوانن بەسەریان سەرکەون بە دەست و ڕم، بەڵام دڵنیا نین لەوەی کە سەردەکەون بەسەریان بە تیرەکانیان، لەم بارە گوماناوییە پەیمانێکی دڵنیاکەرەوەیان بۆ دێت بە سێ شت (چونە ناو بیت الحرام، دڵنیایی، ئەنجامدانی دروشمەکانی)

{ لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِنْ دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا}[الفتح ٢٧].

مسوڵمانان چونە ناو بيت الحرام لە عومرەی قەزا بە دڵنیایی، بۆ سێ ڕۆژ تیایدا مانەوە تا عومرەکەیان تەواو کرد و خودا پەرستییەکانیان ئەنجامدا[1].

قورئان پێشبینی کردووە بەوەی کە ڕۆژێك دێت ئیسلام سەردەکەوێت بەسەر هەموو ئاینەکان، خودای گەورە دەفەرموێت{ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ}[التوبة ٣٣ ] واتە: خودای گەورە پەیامبەرەکە نارد بە ڕێنوینی و ئاینێکی ڕاست بۆ ئەوەی بەسەر هەموو ئاینەکانی سەربخات.

ئەم ڕۆژە هات و ئیسلام بەسەر هەموو ئاینەکان سەرکەوت.

بەڵکو لەم کاتانەی کە بانگەوازی لەو پەڕی نارەحەتی و لە کێشەدا بوو، خودای گەورە بڕیاریدا کە ئیسلام دەمێنێتەوە تا ڕۆژی دوایی{ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ الْبَعْثِ}[الروم ٥٦] واتە: بێگومان ئێوەی مسوڵمان لە عیلم و زانستی خودا ماونەتەوە تا ڕۆژی دوایی.

قورئان ئاشکرای کرد پێغەمبەری خودا(صل الله علیه وسلم) دەگەڕێتەوە بۆ مەکە دوای دەرچوونی لێی بە کۆچکردن{ إِنَّ الَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لَرَادُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ}[القصص ٨٥] واتە: بەڕاستی ئەو زاتەی گەیاندن و کارپێکردنی لەسەر واجب کردی ئەتگەڕێنێتەوە بۆ شوێنی لە دایك بوونت.

وە شوێنی ڕاستەقینەی پیاو شارەکەیەتی.

وە خودای گەورە قوڕەیش دەوڵەمەند دەکات { وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ}[التوبة ٢٨] واتە: ئەگەر ئێوەش دەترسن بەهۆی نەهاتنی هاوبەش دانەران بۆ شاری مەکە هەژار بن و داراییتان نەمێنێت، ئەوا خودای گەورە لە بەخششی خۆی دەوڵەمەندتان دەکات.

هەموو ئەمانەش ڕوویدا.

---

(١) النبأ العظیم، ص ٤٨-٤٩.

جگە لە مانەش زۆر شتی تریش ڕوویدا.

بێگومان هەواڵدانی قورئان بە شتە غەیبەكان كە دێت و ڕوو دەدات هەروەك هەواڵی داوە، دڵنیاكەرەوەیە لەهەموو لایەنێك بۆ ڕاستگۆیی خاوەن پەیامەكە(صل الله علیه وسلم).

دیاردەی قورئانی دیاردەیەكی ئەستەمە.

ئەستەمە دووبارە ببێتەوە

ئەستەمە تەحەدای بكرێت

ئەستەمە ڕووبەڕوو بوونەوەی بكرێت

ئەستەمە بەراورد بكرێت بە جگە لە خۆی

تەنها هاتنی پێغەمبەرێكی(صل الله علیه وسلم) نەخوێندەوار بەم كیتابە بە بەڵگەكانی و یاسا دانانەكانی و موعجیزەكانی و ڕوونكردنەوەكانی گەورەترین بەڵگەیە بۆ ڕاستگۆیی بوونی.

پاشان دەستە وەستان بوونی هاوبەش دانەران لە بەرهەڵستی كردنی یان تەنانەت بەرگریكردن لە دژی، پاشان چاكردنی ئەم كیتابە بۆ گەورەترین دوو كێشە لە بوون كە ئەمانیش( زانیاری، ڕەوشت)، لەگەڵ پاراستنی یەكپارچەیی ڕوونكردنەوە و ڕەوانبێژی داهێنەرانە، وە ڕێك كەوتنی هەموو فرمانكردن و ڕێگریكردنێك لەم كیتابەدا هەیە لەگەڵ دادپەروەری و تەرازووی یەكسانی و فیترەت و ڕێبازی پێغەمبەرانی پێش خۆی؛ كۆمەڵە بەڵگەیەكن بەسەر یەكەوە بۆ كەسێك كە لەم كیتابە بكۆڵێتەوە.

ئەم دیاردە قورئانییە لە بیابان گەلێكی گەورەی دروست كرد كە بۆ چەندین سەدە جیلێكی لە خەڵكی كردە پێشەنگ كە هەرگیز نەیاندەتوانی بچنە ناو مێژوو ئەگەر ئەم دیاردەیە هەڵی نەساندبانەوە.

ئەم ڕاستییە چەسپا لە كاتانێكدا كە بانگەوازی ئیسلام لە لێواردا بوو{ وَإِنَّهُ لَذِكْرٌ لَكَ وَلِقَوْمِكَ ۖ وَسَوْفَ تُسْأَلُونَ}[الزخرف ٤٤] واتە: ئەم قورئانە شەرەف و گەورەییە بۆ خۆت و بۆ گەلەكەت، وە پرسیارتان لێ دەكرێت دەربارەی قورئان، تاچەند كارتان بە بەرنامەكەی كرد و گوێ ڕایەڵی فرمانەكانی بوون.

وە بێباوەڕانی سەردەم نەیان دەتوانی ڕووبەڕووی قورئان ببنەوە تەنها بە قسەی پڕوپوچ نەبێت، كە بێدەنگ بوونیان باشتر و ئاقڵانەتر بوو لە قسەكردن.

لەم قسە پڕوپوچانە: هەندێكیان وای دادەنێن كە پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) قورئانی پێگەیشتووە لە ئاسنگەرێكی مەسیحی كە كاری ئاسنگەری دەكرد، كە ئەم ئاسنگەرە سەرقاڵ بوو بە چەكوشەكەی كە هیچی لە ئینجیل نەدەزانی تەنها چەند هیواو ئاواتێك نەبێت، زمانیشی غەیرە عەرەبی بوو.

هەندێكی تر وتیان: لەوانەیە قورئانی لە بوحەیرای ڕاهیب وەرگرتبێت كە بە منداڵی پێی گەیشتووە.

ئای لەم لۆژیكە، ئەگەر بێدەنگ بوان ئەوا باشتر داپۆشراو دەبوون.

هەندێكی تر وای دادەنێن قورئان قسەی خودی محمدە(صل الله علیه وسلم) وە خۆی ئەو زانیارییانەی داناوە، د. عبدالله الدراز وەڵامی ئەم بانگەشە پێكەنیناوییە دەداتەوە، دەڵێت: بەڵێ، بەڕاستی ئەمە سەیرە، پیاوێكی نەخوێندەوار لە نێو گەلێكی نەخوێندەوار، ئامادەی دانیشتنەكانیان دەبێت-جگە لە دانیشتنی پوچ و تاوان-، بە گوزەرانی وان دەژیت، سەرقاڵە بە ڕۆزیدانی خۆی و خێزانەكەی و منداڵەكانی، شوانی دەكات بەكرێ، یان بازرگانی بە كرێ، هیچ پەیوەندییەكی نییە بە زانست و زانایان، بەم شێوەیە چل ساڵ لە تەمەنی بەسەر دەبات، پاشان لە نێوان شەو و چێشتەنگاوێكدا بۆمان دەردەكەوێت بە شێوەیەك قسەمان لەگەڵ دەكات كە پێشتر لە ژیانیدا لێی نەبینراوە، لەوانەشە لەگەڵ هیچ كەسێك بەیەك وشەش لەمانە قسەی نەكردبێت، بۆمان باسی چاخە یەكەمینەكان دەكات كە خاوەن زانستەكان لە نێو پەڕاو و پەرتووكخانەكان شاردویانەتەوە.

ئایا لە نموونەی ئاوا نەزانەكان دەڵێن كە پێغەمبەر ئەقڵی وەحی بۆ كرد و ویژدانی ڕێگای نیشاندا؟

چ لۆژیكێك ڕێگا دەدات كە ئەم قۆناغە نوێیە زانستییە بەرهەمی سرووشتی ئەم ژیانە ڕابردووە نەخوێندەوارییەی بێت؟

ئەقڵ ناتوانێت ڕابكات لەوەی ئەم گواستنەوە ڕیشەییە نهێنییەكی تری هەیە لە دەرەوەی سنووری نەفس و بازنەی زانیارییە كۆنەكانە.

بێباوەڕە نەفامەکان کە خەڵکە دەشتەکیەکان بوون لە بیابان بەگشتی زیاتر ئەم دیاردەیان لا ئاشکرا بوو و زیاتر تێدەگەیشتن لەم نهێنییە لە بێباوەڕانی ئەم سەردەمە، کە ئەوان وەك بێباوەڕانی ئەم سەردەمەیان نەوت: کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەم هەواڵانەی لە خودی خۆیەوە هێناوە، بەڵکو وتیان: بێگومان ئەو لە ڕۆژی دابەزینی وەحی زانیاری نوێی پێ گەیشتووە، وانەی تێدا خوێند کە پێشتر نەی خوێندبوو، وە فێری زانیاری بوو کە پێشتر نەی دەزانی{ وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ الْآيَاتِ وَلِيَقُولُوا دَرَسْتَ وَلِنُبَيِّنَهُ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ}[الأنعام ١٠٥] واتە: بەم شێوەیە ئێمە بەڵگەکانی خۆمان نیشاتان دەدەین، کەچی بێباوەڕان لەجیاتی باوەڕهێنان دەڵێن تۆ- محمد- ئەم قورئانەت لای خەڵکی خوێندووە، وە ئەم قورئانە ڕوون دەکەینەوە بۆ کەسانێك کە تێدەگەن لە بەڵگە و ئایەتەکانی خودا.

ئەوان ڕاستییان کرد: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وانەی خوێند، بەڵام لای مامۆستاکەی جوبریل، وە نوسییەوە، بەڵام لە پەڕاوێکی بەرزی پاك، بەدەستی فریشتەکان کە بەڕێز و پلە و پایەن.

{ قُلْ لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا تَلَوْتُهُ عَلَيْكُمْ وَلَا أَدْرَاكُمْ بِهِ ۖ فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِنْ قَبْلِهِ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ}[يونس ١٦] واتە: ئەی پەیامبەر بە بێباوەڕان بڵێ: ئەگەر خودا ویستبای نەم ئەتوانی ئەم قورئانەتان بۆ بخوێنمەوە و خوداش فێری نەدەکردن، بێگومان من تەمەنێکی زۆرم لە ناوتان بەسەر برد پێش دابەزینی قورئانیش، باشیش دەزانن کە درۆهەڵبەست نیم، جا ئایا بۆچی بیرناکەنەوە و ئاقڵ نابن؟

ئەمە حاڵی قورئانە لەگەڵ هەواڵە مێژووییەکان، هیچ گفتوگۆ لەوەدا نییە کە ڕێگای هاتنی قورئان نەقڵ کردنە نەك بەکارهێنانی ئەقڵ، ئەمەش لە دەرەوەی نەفسی خۆی هاتووە[1].

---

(١) النبأ العظيم، د. عبدالله الدراز، ص٤٠.

دیاردەی قورئان تەواو جیاکراوەتەوە لەوەی لە دانانی پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) بێت، پێغەمبەر تووشی بەڵای زۆر هات-وەك مردنی خەدیجە و مامی ئەبی طالب-، وە هیچ کاریگەرییەکی ئەم بەڵایانە نابینین بەسەر قورئان.

ناوی خێزانەکانی نابینین لە قورئانی پیرۆزدا لەگەڵ پەیوەست بوونی پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) بە خەدیجە تا کۆتایی ژیانی، لە بەرامبەردا ناوی خاتوو مەریەم دەبینین کە نزیکەی ٣٤ جار دووبارە بوەتەوە.

ئەگەر سەیری مەجاز بکەین لە قورئان دەبینین تەواو دوورە لە خەیاڵی عەرەبی کە موعەلەقات و شیعرەکانیان باسی غەزەل و وەسفی ئافرەت و ئارەق بوو، مەجاز لە قورئان لەوحەیەکی گشتگیری جوانە کە ئەو ڕووبارانەی بەنێو گژوگیای سەوز دەڕۆن تێکەڵ دەبن لەگەڵ ئەو تاریکاییەی کەلە نێو دەریا تاریکەکان هەیە، لە نێو ئەم پارچە ئەدەبییە بابەتی زانستی ورد و زانیاری ورد بوونی هەیە، چونکە کیتابێکە بە وەحی نێردراوە لەلایەن دروستکەری ئاسمان و زەوی.

لە چوارچێوەی قسەکردنمان دەربارەی وردی بابەتی زانستی، قورئانی پیرۆز تاکە کیتابی پیرۆزە لەسەر ڕووی زەوی کە خاڵییە لە یەك هەڵەی زانستی، ئەمەش لە خۆیدا گەورەترین موعجیزەی زانستییە بە ڕەهایی.

لەبەرامبەردا نوسراوێك یان پەرتووکێکی بچووکی نوسراوم بدەرێ کە پێش دووسەد ساڵ نوسرابێت، باسی هەر بابەتێکی زانستی بکات، چەندین هەڵەی زانستیت بۆ دەردەهێنم تیایدا.

ئەرستۆ سێ کیتابی زانستی نووسی( دەرباری سروشت، لەسەر ئاسمانەکان، لەسەر زەوی)، ئەم سێ کیتابە ئەمڕۆ یەك ڕستەی ڕاستی زانستی تێدانییە، ئەرستۆ بە پێی ئەم کیتابانە وای دەبینێت کە:

ژمارەی ددانی ئافرەت جیایە لە ژمارەی ددانی پیاو!

لە سنگی ئافرەت تەنها سێ پەراسوو هەیە!

كاری مۆخ ساردكردنەوەی خوێنە لە كاتێكدا كاری دڵ گەرمكردنیەتی[١].

ئەرستۆ وای دەبینێت كە ئاوی ژێر زەوی پێك دێت لە ئەنجامی كونێك لە ناخی زەوی كە ئاوی دەریا دەگوازێتەوە بۆ ئاوی ژێر زەوی.

وە چەندان نموونەی تریش لە ئەفسانەی زانستی كە كیتابەكانی پڕكردوون، لە كاتێكدا قورئان لە بابەتی ئاوی ژێر زەوی پوختەی ئەم زانستە دەڵێت كە لەم دواییانە زانست پێی گەیشتووە لە چەند دەساڵێكی ڕابردوو، كە ئاوی ژێر زەوی سەرچاوەكەی باران بارینە{ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَسَلَكَهُ يَنَابِيعَ فِي الْأَرْضِ}[الزمر ٢١] واتە: ئایا نەتبینیوە كە خودا لە ئاسمانەوە بارانی باراندوە و جا ئاوی ئەم بارانەی خستە ناو كانیاوەكانی زەوی- ئاوی باران دەچێتە ناو كانیاوەكان-.

سەرچاوەی ئاوی ژێر زەوی ئەو كانیاوانەن كە دروست دەبن لە باران بارین، نەك ئەم كونەی ئەرستۆ كە لە قوڵایی كیشوەر هەیە.

موعجیزەی زانستی لە قورئاندا مەزنترین موعجیزەی زانستییە بە ڕەهایی.

بە پێی بنچینەی بۆكالیزمی كە مۆریس بۆكای دای ناوە لە پێش چەند دەیەیەكی كەم، قورئانی پیرۆز دوای پێداچونەوەیەكی وردی زانستی، تاكە كیتابە كە یەك هەڵەی زانستی تیادا نییە لەگەڵ ئەوەی تەمەنی ١٤٠٠ ساڵە[٢].

لەگەڵ ئەوەی قورئان كیتابی چاكسازییە بۆ بڕوابوون بە خودا و ڕەفتارەكان لە پێگەی یەكەمدا.

ئەگەر لە قورئانی پیرۆزەوە بچیتە سەر كیتابەكانی تر، سەیرێكی بكەین لە وردی بابەتە زانستییەكان لەم كیتابانە، هەندێك نوسراو دەبینیت دڵنیایی دەبەخشن بۆ دەستكاریكردن لەم كیتابانە!

(1) http://chsi.harvard.edu/bok/06.html.

(2) (1) Buchaillism at Wikipedia.

وابێنە بەر چاوت ئەگەر یەك پارچە لە کیتابی (الفیدا) کیتابی پیرۆزی هیندۆسەکان بوونی هەبێت لە کیتابی خودا؟

**ئێستا هەندێك پارچە نووسین دەخەمە بەردەستتان لە کیتابە کۆنەکان:-**

- الفیدا دەڵێت زەوی جێگیرە، ناجوڵێت(١)

- خودا زەوی بە جێگیری درووست کردووە(٢)

- خۆر بەدەوری زەوی دەخولێتەوە لە نێو گالیسکەیەکی زێڕین حەوت ئەسپ ڕای دەکێشن(٣).

- گا ئاسمان جێگیر دەکات(٤)

**یاجور فیدا کە یەکێکە لە چوار کیتابە یاساییەکەی هیندۆس**

- فیشنور بارانا دەڵێت خۆر ٨٠٠ میل لە زەوی دوورە، لە کاتێکدا ماوەی نێوانیان بە زانستی ٩٣ ملیۆن میلە.

- الأثارفا فیدا دەڵێت: مانگ لەنێو دەریایەکی ئاودا دەخولێتەوە(٥)

وە زۆری تریش لەم هەڵە زانستیانە هەیە، سوپاس بۆ خودا بۆ کۆتا ئاینی پارێزراو، کە بەرێزترین دروستکراو محمد (صل الله علیه وسلم) پێی گەیاندووین، بە تەواوی و بێ کەموکوڕی.

---

(١) الریج فیدا ١٢١.

(٢) یاجور فیدا ٣٠.

(٣) یاجور فیدا ٣٣-٤٣.

(٤) یاجور فیدا ٣٠.

(٥) آثار فیدا ١-٨٩.

ئەگەر سەیری دانانی دیاردەی قورئانی بكەین لە لایەنی بیروباوەڕ و یەكتاپەرستی، قورئان لە بەرزترین پلەیە لە پاك كردنەوەی بیروباوەڕی یەكتاپەرستی لەهەموو چڵكێكی كوفری، د. الطیب بوعزة دەڵێت( قورئان بەردەوام ڕۆڵی كیتابە پیرۆزەكان لە بابەتە یەكتاپەرستییەكان دەچەسپێنێت، لەگەڵ ئەمەش قورئان بەردەوام دەرهێنانی خودا لە بازنەی خۆویستی یەهودی- كە پێیان وایە خودا تەنها بۆ گەلی یەهوودە- و لە چەند خودایەتی مەسیحییەكان- بیروباوەڕی سێ خودایەتی كە مەسیحییەكان كەوتونەتە نێو ژاوە ژاو و گومان- دەردەهێنێت، خودا خودای هەموو جیهانە و تاك و تەنهایە، بەهیچ شتێك ناچێت و هەر ئەو بیسەری بینایە، بۆیە دواتر چەندین چاك كاری كرا لە بابەتی خودایەتی لە نێو ئاینی جوولەكە و مەسیحییەكان لەسەر دەستی توما الأكویني و موسا بن میمون، بەهۆی خوێندنەوەیان بۆ بڵاوكراوە ئیسلامییەكان لە بیروباوەڕی پاك بەخودا، كە تاوانی جوولەكە و مەسیحییەكان شێواندبوویان، ئەم دوو پیاوە هەوڵیاندا گونجاندن بكەن لە ئاینیەكەیان بەوەی بگونجێت لەگەڵ بیروباوەڕی پاكی ئیسلام دەربارەی خودا كە هەموو شوێنكەوتوانی ئاینەكان بۆخۆی كێش دەكات، ئەگەر دەستكاری خێرای ئەم دوو بیروباوەڕە نەكرێت بۆ داپۆشینی ئەم قڵیشە و هەوڵدان بۆ نزیك بوونەوە لە بیروباوەڕی ئیسلامی پاك و چەسپاندنی ئەوەی هەردوو بیروباوەڕەكەی تر دروستبوونی بنەڕەتییان و كۆڵەگەكانیشیان لەسەر یەك خودا پەرستییە لەسەر شێوازی بیروباوەڕی ئیسلامی، ئەم چاكسازییانەی كە خرایە نێو هەردوو بیروباوەڕەكە هیچ ڕێگریەكی نەبوو بۆ ڕاگوەستاندنی بە كۆمەڵ چونە نێو ئاینە نوێكە لەلایەن شوێنكەوتوانیان[١].

**لە كۆتاییدا:**

ئایا هیچ بانگەشەیەك ماوە بۆ ئەو بانگەشەكەرانەی كە پێیان وایە قورئان لە دروستكردنی محمدە(صل الله علیه وسلم)؟

---

(١) د. الطیب بو عزة علی منتدی التوحید – بتصرف-.

د. عبدالله الدراز دەڵێت( كەواتە ڕوونە كە قورئان هیچ دانانێكی محمدی(صل الله علیه وسلم) تیادا نییە، وە هیچ یەكێك لە درووستكراوەكان، بەڵكو قورئان لەلایەن خوداوەیە بە وشە و ماناكەی، وە سەیرە كە هەندێك لە خەڵكی هێشتا پێویستییان بە بەڵگە هێنانەوە هەبێت لەوەی كە قورئان لەلایەن محمدەوە نییە.

لەڕاستیدا ئەگەر ئەم بابەتە دادوەرێكی بۆ هێنرا كە بەدادپەروەری بڕیاربدات، بەسی بوو بە گوێ لێبوونی ئەم شایەدییەی كە لەسەر زمانی محمد هاتووە دەربارەی خۆی.

چ بەرژەوەندییەك هەیە بۆ كەسێكی ئاقڵ كە بانگەشەی سەركردایەتی دەكات بۆ جگە لەخۆی و تەحەدای خەڵكی دەكات بەشتی سەیروسەمەرە و موعجیزە بۆ پشتگیریكردنی ئەم سەركردایەتییە، وە چ بەرژەوەندییەكی هەیە لەوەی بابەتەكانی خۆی بداتە پاڵ كەسێكی تر، ئەگەر بیدایە پاڵ خۆی هیچ مرۆڤێك نەبوو بەرهەڵستی بكات و بۆخۆی بگێڕابایەوە؟

بەڵكو پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم) شایەدی دەدات بۆخۆی بەوەی كە دەستەوەستانە لە هێنانی نموونەیەكی وەك قورئان { قُلْ لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا تَلَوْتُهُ عَلَيْكُمْ وَلَا أَدْرَاكُمْ بِهِ ۖ فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِنْ قَبْلِهِ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ} [يونس ١٦](١).

ئەمە بابەتێكی دادوەرییە، بابەتێكی یەكلاكەرەوەیە، بابەتێكە ئەقڵ و لۆژیك پەیوەستە پێی، بەوەی كە: ملكەچ بوون بەوەی قورئانی پیرۆز وەحییە لەلایەن خودای گەورەوە.

---

(١) النبأ العظيم، ص٢١.

# ناوەڕۆك

پێشەکی........................................................٣

بەشی یەکەم......................................................٥

باوەڕهێنان یان ئاژاوە و فەوزا.....................................٦

باوەڕهێنان یان ئاژاوە و فەوزا.....................................١٢

بەشی دووەم.....................................................١٩

دیاردەی پێغەمبەرایەتی...........................................٢٠

پێغەمبەرایەتی و ئەقڵ............................................٢٠

هەموو چاکەیەك لە بوون سەرچاوەکەی لە لایەن پەیامبەرانەوەیە...........................................٢٧

باوەڕی بەندەیەك ڕاست نابێت کە باوەڕی بە پێغەمبەرێك هەبێت و کافربێت بە محمد(صل الله علیه وسلم)...........................٣٤

سیفەتەکانی پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم)........................٤٢

هەندێك لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی محمد(صل الله علیه وسلم)...................................................٥١

بەشی سێیەم....................................................٥٩

دیاردەی قورئان تەحەدای بێباوەڕان دەکات.......................٦٠

ناوەڕۆك.........................................................٨٩